وأن هذا صراطي مستقيما فاتبعوه ولا تتبعوا السبل فتفرق بكم عن سبيله

STATE POULTRY ENTERPRISE OF NORTHERN AREA

# پایەی ژیان لە ئیسلام دا



چاپی دوەم

OF NORTHERN AREA

علی حیدر بەردەگۆزی      خالد ولی علی

SE OF NORTHERN AREA

# پێشکەش

— بەو لاوە موسوڵمانە شیرین ڕەفتارانەی کە بە کردەوەی ڕاستو دروستی خۆیان سەرنجی لاوە خوێن گەرمەکـانی دەوروبەریان بۆلای ئیسلام ڕادەکێشنو پێیان دەسەلمێنن کە تەنهـــا ئیسلام دەتوانێ مرۆڤی ڕەوشت بەرز دروست بکات ٠

— بەو خوشکانەی کــەبەفاکو فیــکی ڕۆژئاوا هەڵناخەڵەتێنو گەردەلولی نەفامی نوێ کاریان تێ ناکات ٠

— بەولاوە شەکەتو ماندوانەی کە بەدوای ڕاستیدا وێڵنو هـەموو هۆشو بیریان خستۆتە گەڕ بۆ هەڵهێنانی مـــەتەڵی ژیانو ، مەبەست لە هاتنە دنیایان ٠

# یاسای ژیان لە ئیسلام دا

چاپی یەکەم

علی خدر بەردەکۆزی خالد ولی علی

چاپخانەی «الحوادث»

بەغدا - ١٩٨٧

# پێشەکی

مرۆڤ(١) هەر بە سرووشت حەز لە ژیانی کۆمەڵ و شارستانیەت دەکات ، کەواتە پێویستە لە ناو کۆڕو کۆمەڵی ئادەمیزاد ژیان بەسەر بەرێت ، چونکە هیچ کاتێك ناتوانێ بە تەنیا هەموو پێویستیەکانی ژیانی خۆی دابین بکات ، هەروەك چۆن ئارەزووی جنسی پاڵی پێوە دەنێ بۆ تێکەڵ بوون‌و کۆ بوونەوە ، بێگومان ئەمەش یەکێکە لە حیکمەتەکانی خوای گەورە بۆ ئاوەدان کردنەوەی زەوی‌و ، بەردەوام بوونی ژیانێکی خۆش‌و ڕازاوە بۆ بەرەی ئادەمیزادی داهێنوو ، بۆ ئەوەی ببنە جێ‌نشینی خوا لە سەر زەوی ، ئینجا لە کۆمەڵگای ئادەمیزاددا چەند پەیوەندی‌یەکی پێکەوە بەستراوو جیا جیا پەیدا دەبن ، وەهەر کاتێك ئادەمیزاد لە خوڕەووشت دوور خرایەوە تووشی تێکدان‌و ململانەو کوشتن‌و بڕین‌و قات‌و قڕی دەبێت‌و ، ئاژاوەو گێچەڵ پەرە دەسێنێت‌و ، دەسەڵاتدار بێ دەسەڵات‌و ، بە هێز بێ هێز لە ناو دەبات ، وە یاسای ئاژەڵی دێتە کایەوەو ، خواست‌و ویستی مرۆڤایەتی لە ئەنجامی بێ یاسایی‌و شیرازە پچڕانی لە ناو دەچێت‌و ، بەد بەختی‌و چارە ڕەشی ڕوو

---

(١) ئەم کتێبە لە نامیلکەی (نظام الحیـــاة في الاسلام) نوسراوی ( ابو الاعلی المودودی ) وەرگێراوە ٠

له خۆیان‌و نەوەکـــانیان دەکـــات ، وەئاوەدانی‌و شێوازی ژیانیان تێك دەچێت • جا لــە بەر ئـــەوە پێویست بە بوونی یاسایەك دەکـــات بۆ ڕێکخستنی ژیانی خەڵـکی تاوەکو ئاراستەی هەموو هێزو پەیوەندیەکانی بـکات ، لە پێناو بنیات نان‌و ئاوەدان کردنەوەی زەوی‌و پشت بەیەکتری بەستن‌و کۆمەکی‌و هاوکـــاری یەکتری‌و هێنانە کایەوەی ئاسایش‌و داد پەروەری‌و بـــە دەست هێنانی گەورەترین ئەندازە لـــە بەرزەوەندی‌و کەڵك بۆ هەموو ئەندامێك لە ئەندامەکانی ئەم کۆمەڵگایە ، وە چـــارە سەر کردنی هـەموو کێشەو تەنگ‌و چـــەڵەمەیەك بەبێ ئـەوەی تووشی بەرهەڵستی‌و زۆران بازی‌یەك ببین : یان بە لای کەمەوە کەم کردنەوەی ئەو گیرو گرفتانە بە پێی توانا • وە ئەوەش پێویستی بەوە دەکات کـە سەربەستی ئەندامەکانی کۆمەڵ بە چەند مەرجێکەوە ببەسترێتـەوە تـــا ببێتە هـۆی دوور خستنەوەیان لـــە دوو بەرەکی‌و ، دووژمـــن کاری یەکتری ، لــە بەر ئەوە ، سەربەستی‌یەکی بەرەڵایانـەو بێ سـنورو ، کۆبوونەوەیەکی بێ یاسایانەی مرۆف لەگـەڵ یەکتری‌دا دوو دوژمنی ترسناکن‌و نابێ بە شتێکی سادەو بێ بایەخ سەیریان بکەین •

ئای لەو نموونە جوانەی کە پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) لـە فەرمایشتێکی‌دا بۆی دیاری کردووین کە دەفەرمووێ :

( مَثلُ القائمِ في حدودِ اللهِ والواقعُ فيها كَمثلِ قومٍ استهموا على سفينةٍ فصارَ بعضهم اعلاها ، وبعضهم أسفلها وكانَ الذين في أسْفَلها اذا استقوا منَ الماءِ مرّوا على مَن فَوقهم فقالوا : لو أنا خَرقنـــا في نصيبنا خَرقاً ولم نؤذِ منْ فوقنا فان تركوهم وما أرادوا هلكوا جميعاً وان أخذوا على أيديهم ينجوا وينجوا جميعاً ) رواه البخاري •

واتە : وێنەی ئەو کەسەی کە بەپێی دەستورو یاسایی خوا هەڵ دەستێ‌و کاروباری دەبا بەڕێوە وەکو وێنەی گەلێك وایە کە پشك (قرعـة)بکەن بۆ سوار بوونی کەشتی جا هەندێکیان لای سەرەوەیان بەر دەکەوێ‌و وە هەندیکیان لای خوارێ ، وە ئەوانەی لای خوارەوەن ئەگەر ئاویان بردبا بە سەر ئەوانەدا ڕەت دەبوون کە لە سەرەوەن ، ئینجا لە نێو خۆیاندا بڕیاریان داو گوتیان : ئێمە لە بەشی خۆمان کەشتی‌یەکە کون دەکەین ، وە ئازار بە ئێوە ناگەیەنین • جا لێرەدا ئەگەر کۆمەڵی سەرەوە لێ‌یان گەڕێن ئەو کارە بکەن ئەوە هەموویان لە ناو دەچن ، بەڵام ئەگەر دەستیان بگرن‌و بیان گێڕنەوە لەو کارە ، ئەو کاتە ئەمانیش‌و ئەوانیش رزگاریان دەبێت[1] • وە ئەو مەرجانەش لەو ڕژێم‌و یاسایانەدا خۆ دەنوێنن کە پێشەنگی کاروانی ژیان‌و خەڵکی دەجوڵێنن‌و هەموو ماف‌و پێویستی‌و بەرژەوەندی‌و بەر پرسیاری‌یەکانی مرۆڤ دیاری دەکەن •

ئادەمیزاد هەر لە بەرەبەیانی مێژوودا ئاشنایەتی لە سەر سێ شتی بنچینەیی‌دا پەیدا کردووە :

١ ـ لە سەر بنچینەی جینسی •
٢ ـ لە سەر بنچینەی زەوی (نیشتمان) •
٣ ـ لە سەر بنچینەی بیرو بڕوا (عقیدة) •

---

(١) لەم فەرمایشتە پیرۆزەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت ئەگەر لە نێو کۆمەڵدا کەسانێك هەبوون کە چەند هەڵویستێکی وایان دەکرد دەبوو بە هۆی لە نێو چوونی خۆیان‌و خەڵکی بێ تاوانی دیکەش ئەوە لەو کاتەدا پێویستە دەستیان بگرین‌و لەو خراپەیە بیان گێڕینەوەو ، ڕێگای ڕاستیان نیشان بدەین بۆ ئەوەی ژیانی هەموو مرۆڤەکان پارێزراو بێت‌و نەکەوێتە مەترسی‌یەوە •
وەرگێڕ

هیچ گومانی تێدا نی‌یە کە بنچینەی سێیەم واتا ( بنچینەی بیـــرو بڕوا ) هــەر ئەوە کە لەگەڵ تایبەت کاریی‌یەکانی مرۆڤ‌و شوێنیــدا دەگونجێ ، چونــکە بیرو باوەڕ بەرهەمێکە لە بەرهەمەکانی هۆش‌و بیر کردنەوە ، کــە ئەویش بەرز ترین پلەو پایەی مرۆڤایەتی‌یە ، ســـەرە ڕای ئەوەی کــە بڕوا تاکــە بنچینەیەکی دەست کـــەوتی ئینســان‌و هەڵبژاردنیەتی ، وە سەر بەستی بەنرخترین بەخششە کــە ئینسان پێی بەهرەوەرە ، وە هەردووکیان واتــە ( هۆش‌و هەڵبژاردن ) نیشانەی لێ پرسراوی‌و ڕێزی مرۆڤە ئا لێرەدا جیاوازی نێوان کۆمەڵگای ئیسلامی‌و کۆمەڵگا نەفامی‌یەکانی دیــکە دەردەکەوێت • چونــکە بــە ڕاستی پێغەمبەرمان محمد (صلی اللە علیه وسلم) هەستا بە دامەزراندنی بنچینەی کۆمەڵگای ئیسلامی لە شاری مەدینەی پیرۆز لە ســـەر بنچینەی بیرو باوەڕی ڕاستەقینە وە هەر لە سەر ئەم بنچینەیە برایەتی خستە نێــوان بیلالی حەبەشی‌و •• صوهەیبی ڕۆمی‌و ئەبوبەکری قوڕەیشی‌و سەعـدی کوڕی معاذی مەدینەیی •

کەواتە پێویستە خەڵکی کۆ بنەوەو لە هەمان کاتدا یاســـاو پەیڕەوێکیان لە ناو دابێت بۆ ئەوەی لە سەری بڕۆن •

جا ئەبێ چ کەسێك هەبێت شایەنی ئەوە بێت کە ئەم یاســایە بۆ کۆمەڵی ئادەمیزاد دابمەزرێنێت ؟ ئا لێرەدا جیاوازی دووەم دەردەکەوێت لە نێوان کۆمەڵگای ئیسلامی‌و کۆمەڵگاکانی تر •

ئاینی ئیسلام لــە ســەرەتادا یاسا دانان بــە مافێکی بێ خــەوشی (خالص)یەزدان دادەنێت • واتە :

بەرنامــە دانان بۆ بەڕێوەبردنی ژیان تەنهـا دەبێت لــە لایەن پەروەردگارەوە بێت •

چونکه یاسا دانان یەکێکە لــە تایبەت کاری‌یەکانی خــوایەتی پەروەردگــار ، هــەر وەکو خوای گــەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرمووێ :

( شَرَعَ لَـكُمْ مِنَ الدِّينِ مَا وَصَّى بِهِ نُوحاً وَالَّذِي أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ وَمَا أَوْحَيْنَا بِهِ إِبْرَاهِيمَ وَمُوسَى وَعِيسَى أَنْ أَقِيمُوا الدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُوا فِيهِ ) الشورى ١٣ •

واتە : ئەی ئادەمیزادەکان ئەو ئایەتەی کە محمد ( صلی اللە علیە وسلم ) هێناویەتی بۆ ئێوە ئایینی خوا بە یەك ناسینەو ئایینێکی دامەزراوی لە مێژینەیە ، ئایینێکی وام بۆ دامەزراندون کە بریتی‌یە لە ئامۆژگاریانەی کە (نوح) پێغەمبەر (علیە السلام) کردوویەتی ، وە ئەوەی کە ( ئیبراهیم و موساو عیسا ) ( علیهم السلام) ڕایان گەیاندوە •

ئەوە ڕاگرتنی ئایینی خوایە بە شێوەیەکی ڕاست وە قەدەغە کردنە لە پەرتەوازەیی ، وە هەروەها فەرموویەتی :

( ثُمَّ جَعَلْنَاكَ عَلَى شَرِيعَةٍ مِنَ الْأَمْرِ فَاتَّبِعْهَا وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَ الَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ) الجاثية (١٨) •

واتە : لە دوایدا تۆمان دانا لە سەر بەرنامەیەکی بەرزو دامەزراو بۆ کاری دونیا تۆش شوێنی ئەو بەرنامەیە بکەوەو ، شوێنی ئارەزووی بوچی ئەوانەی نەزانن‌و ئاگایان لــە شتی ڕاستەقینەو بــە سوود نی‌یە مەکــەوە •

هەروەها لە ئایەتێکی دیکەدا فەرموویەتی :

( فَاحْكُمْ بَيْنَهُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَهُمْ

عَمَّا جَاءَكَ مِنَ الْحَقِّ وَلِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنْكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجاً ) المائدة (٤٨) •

واته : حوكميان له بەیندا بكه بەو دەستورەی كه خوای گەورە ناردوویەتی‌و ، وە بە دوای هەواو ئارەزوویان مەكەوەو ، لامەدە لەو بەرنامەیەی كه بۆت هاتووە ، وە بۆ هەر یەكێك لە ئێوە دەستوورو بەرنامەیەكمان داناوە •

وە له ئایەتێكی تردا دەفەرموێ :

( أَمْ لَهُمْ شُرَكَاءُ شَرَعُوا لَهُمْ مِنَ الدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَنْ بِهِ اللهُ ) الشورى (٢١) •

واته : یان ئەوان هاوتایەكی دیكەیان هەیە كه دەستوریان بۆ دادەنێت كه خوا پێی ڕازی نی‌یە • وە هەروەها فەرمویەتی :

( انِ الْحُكْمُ الاَّ لِله أَمَرَ اَلاَّ تَعْبُدُوا الاَّ ايَّاهُ ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ وَلَكِنَّ اَكْثَرَ النَّاسِ لاَ يَعْلَمون ) يوسف (٤٠) •

واته : بە ڕاستی داد پرسی تەنها شایستەی خوایە وە فەرمانی كردووە بێجگە لە ئەو مل بۆ هیچ كەسی دیكە كەچ نەكەین ئەمە ئاینی ڕاست بەڵام زۆربەی خەڵكی نازانن •

هیچ گومانی تێدا نی‌یە كە ئەو خوایەی هەموو بوونەوەری دروست كردووە لە هەموو كەسێك زاناترە بە دروست كراوی خۆی‌و شارەزا ترە بەوەی كە چ ڕێبازێك لە بەرژەوەندی ئەوانەو بەكەڵكە بۆیان ، هەروەكو چۆن كە داد پرسینی هەموو داد پرسانە ، لە خودی خۆی‌و لە كارو فەرمان‌و قەدەغە كردنی‌دا ، وە هەر وەكو چۆن سۆزو

بەزەیی بەرابەر بە بەندەکانی لە هەموو شتێك فراوانترە وە هەر وەکو چۆن پاكو بێ گەردە لە وەی کە پاڵبدرێت بەلای کۆمەڵێکەوە یان چینێکەوە ، وە یان ڕەگەزێك لە بەندەکانی‌یەوە ، هەر وەکو کە بێ نیازە لە هەموو ئەو سوودو کەڵکانەی کە دادەنرێت •

کەواتە ئەو هەموو سیفەتە بەرزانە یاساو دەستووری خوای گەورە دەگەیەنێتە پلەو پایەیەکی زۆر بەرزو نەبڕاوە ، هەر وەکو چۆن ئەزموونەکانی مرۆڤ لە خولگەی ژیان لە بواری یاسا داناندا دەبێتە هۆی لە ناو چوونی خاوەنی‌یەتیان بۆ ڕێکخستنی کارو باری ژیانیان ، ئا ئەم جۆرە ئینسانانە یاسایەك دادەنێن‌و لە دوایدا بە دەستی خۆیان هەڵی دەوەشێننەوە ، وە لە یەك بەرەدا لە دژایەتی یەکەوە دەگوێزنەوە بۆ دژایەتی‌یەکی دیکە • وە شتێك کە سروشتی مرۆڤ‌و ژیری‌و زانیاری‌و تاقی کردنەوە بەزەرەرو زیانی داناوە ئەوان بە ڕەوای دادەنێن • وەکو : بە ڕەوا زانینی خواردنەوەی مەی‌و داوێن پیسی سود خواردن‌و ، چەند شتی دیکەی زیان بەخش کە لە هەموو کەلێن‌و قوژبنێکی سەر زەوی کراوە ، ئەویش لە لای یاسا دانراوەکانەوە : مادام هەر خوای پەروەردگار گەورە بێت‌و مرۆڤیش بەندەی خوا بێت ، ژیانیش بەخششێکی خوایی بێت بۆ ئینسان بۆ ئەوەی ببێتە جێ نشینی خوا لە سەر زەوی‌و ، ئاینی ئیسلامیش ئەو ئاینەیە کە خوا هەڵی بژاردووە بۆ ئادەمیزاد ، هەر وەکو لە قورئاندا دەفەرموێ :

( إِنَّ الدِّينَ عِندَ اللَّهِ الْإِسْلَامُ ) آل عمران (١٩) •

واتە : ئاینی ڕاست‌و ڕەوا لە لای خوای گەورە تەنها ئاینی ئیسلامە هەروەها فەرموویەتی :

( اَلْيَوْمَ اَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ واَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الْاِسْلاَمَ دِيناً ) المائدة (٣) •

واته : ئیمڕۆ ئاینەکەتانم کە ئیسلامە بۆ تەواو کردن وە ئازو نیعمەتەکانی خۆمم بۆ ئێوە تەواو کرد ، وە ڕازیم بەوەی کە ئاینی ئیسلام ڕێبازتان بێت •

پێویستە لە سەر بڕواداران کە ژیانیان ڕێك پێك بکەن بەو ئاینە کە خوا بۆیانی هەڵبژاردووە • بەڵام ئایا ئەم یاسایە کامەیەو سیفەتەکانی چین ؟ وە شوێنەواری ئەم سیفەتانە لە ژیاندا چین ؟ بە ڕاستی وەڵام دانەوەی ئەو پرسیارانە بابەتی ئەو پەڕتوکەمانە کە بە شانازیەوە دەیخەینە بەردەمی خوێنەرانی بەڕێز وە ئەم کتێبە بەس تێوکێکە یان ڕەنگ ڕشتێکی گچکەیە کە دەگونجێ دیواری بە دەوردا بکرێ‌و فراوان بکرێ چونکە زۆر کورتە بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەم کورتیە ڕوونی‌و ئاشکرایی‌یەکی زۆرو سنور کێشانێکی ووردی لەگەڵە •

لە سەرەتادا دەست بە شیکردنەوەی یاسای ڕەوشتی ئیسلامی دەکەین ، کە چۆن لە سەر بیروو باوەڕ دای‌دەمەزرێنێت ، بۆ جوڵاندنی هەستی مرۆڤ‌و ، بێدار کردنەوەی دڵان ، وە ئاینی ئیسلام بۆ دیاری کردنی چاکەو خراپە پشت بە سروشتی ئادەمیزاد دەبەستێت وە لە هەمان کاتدا ئاینی ئیسلام ئاینێکی چەسپاوەو گۆڕان‌و زیادو کەمی بە سەردا نایەت ، چونکە ئاینی ئیسلام هەر لە سروشتدا پەیوەندی بە گیانی ئینسانەوە هەیە ، لە بەر ئەوە سەرچاوەیەکی وا دامەزراوو نەمری هەیە کە قورئان‌و ڕێبازی پێغەمبەرە ( صلی الله علیه وسلم ) وە تەنها ڕەزامەندی خوای گەورە ئامانجی هەرە بەرزی هەموو موسڵمانانە لە

دوایی‌دا هەستاوین بە ڕوون کردنەوەی یاسای ڕامیاری‌و ڕاگـەیاندنی یەکتا پەرستی خوای گەورە ، لە بەندایەتی‌و ملی کـــەچی‌و داد پرسی‌و فەرمان کردن‌و قەدەغە کردن ، مانای دان پێدا هێنان بەوە کە تەنیا خوای بالا دەست شایانی دانانی یاســاو ، دەستوورو ، بەرنامەی ژیانە ، نـەك ئادەمیزادەکان • ئەم یاسایەش لە ڕێـگای پێغەمبەر ( صلی الله علیـه وسلم )و قورئانی پیرۆزەوە پێمان گەیشتووە ، وە دەوری ئادەمیزادیش لە مـەدا تەنها جێ شینی‌و هێنانە کایەی ئەو شتانەیە کـە خوا دەیەوێت بچەسپێت •

وە فەرمان ڕەوایانی موسڵمان پێویستە کە موسڵمانان هەڵی بژێرن بە ڕەزامەندی خۆیان ، وە لە هەمان کاتدا پێویستە ئەم فەرمان ڕەوایـــە چەند مەرجێکی تێدا بەدی بـکرێت ، وە خوا پەرستی‌و شارەزایی‌یەکی تەواوی هەبێت لە ئاینی ئیسلام‌و ، لێهاتوویەکی هەبێت بۆ ئاسان کردن‌و بەڕێوە بردنی کارو باری دەوڵەت ، لە کاتی ئاشتی‌و جەنگدا •

وە ڕەوایی‌و تەواوی فەرمان بەری موسوڵمان لە دوو شوێنـــدا دەردەکەوێت :

١ ــ چەسپاندنی یاساو دەستووری خوا •

٢ ــ بڕوا پێ کردن‌و هەڵبژاردنی لە لایەن گەلەوە ، هــەر وەکو ڕاوێژ کردن بنەمایەکی بنچینەیی‌یە لە بنچینەکانی یاسای ئیسلام •

وە ئەو پەیڕەوە (ئیسلام) پەیڕەوێکی خوو و ڕەووشتی‌یە ، ڕێگە بـــە فێڵ‌و ، درۆو ، هەڵخەڵەتاندن‌و ، زوڵم‌و ، زۆرداری‌و ، دوو ڕوویی ، نادات ، ئەمەش بە پێچەوانەی چەمکی ئەو ڕامیاریانەن کـــە ئیمڕۆ لە جیهاندا بڵاون ، کە ڕێـگای ( میکافیلی )یان کردووە بـــە

بەرنامەی ڕامیاری • بەهانەی نا بەجێ دەهێننەوەو ، پاکانە بۆ وەسیلە دەکەن(١) ، گەورە ترین تاوان دەکەن ئینجا سەدان بیانوو پاکانەی درۆ دەهێننەوە •

ئینجا یاسای کۆمەڵایەتی ئیسلام دەخەینە ڕوو ، ئەو یاسایەی کە هەموو بەرەی ئادەمیزاد بە یەك چاو سەیر دەکات ، لە ڕووی •رۆڤایەتی‌یانەوەو ، هیچ جۆرە جیاوازییەك لە نێوانیاندا ناکات لە سەر ئەو بنچینەیەی کە پەیوەندیان پێوە هەیەو ، دەسەڵاتی خۆیانی تێدا نیە ، وەکو :

ڕەگەزو ڕەنگ‌و نیشتمان‌و زمان •

وە خوای گەورە لەو بارەوە دەفەرمووێ :

( يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنْثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوباً وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ ) حجرات (١٣) •

واتە : ئەی خەڵکینە ئێمە ئێوەمان لە نێرو مێیەك دروست کردووە وە کردوومانن بە چەند گەل‌و هۆزێك بۆ ئەوەی یەکتر بناسن ، وە بەڕێز ترینتان لای خوا ئەو کەسەیە کە خوا بەرستی لە هەمووتان زیاتر بێ ، بە ڕاستی خوا زاناو ئاگادارە •

جا لە بەر ئەوە کۆمەڵگای ئیسلامی باوەشی گرتۆتەوە بۆ هەموو ئادەمیزادێك بۆ ئەوەی هەر یەکێك لەوان ببێت بە ئەندامێك لەم

---

(١) واتە : چونکە ئامانج‌و هەدەف پیرۆزە ئەگەر ڕێی خەراپیشی بۆ بەکار بهێنرێ قەیدێ ناکە •!!

وەرگێر

کۆمەڵگایە بەبێ بچوکترین جیاوازی لە مافو ئەرکی سەر شانیاندا ، مانای وایە ئەو کۆمەڵگایە کۆمەڵگایەکی جیهانی مرۆڤایەتی بیروو باوەڕی‌یە •

وە لە ناو ئەو کۆمەڵگایەدا هەموو ئەندامەکانی ڕێكو پێك دەخات لە چەند خێزانێکداو بەرنامەیەکی دوورو درێژ دادەنێت بۆ هاوسەری‌یەتی ژنو مێردو کۆبوونەوەیانو هەستان بە کارو باریان وە ئەو مافانەی کە لە مابەینی ژنو مێرددا وە یان ڕۆڵەکانو باوکاندا هەبێ • وە ئاینی ئیسلام داوای خۆ پاراستن لەو تاوانە کۆمەڵایەتیانە دەکات کە دەبنە هۆی تێکچوونی ژیانی خێزان لە ڕێگای دانانی چەند یاسایەك :ـ

١ ـ وەکو یاسای خۆ داپۆشینی ئافرەت ، وە قەدەغە کردنی تێکەڵ بوونی ژنو پیاوو ، گۆرانی ووتنو سەما کردنو ، چەندەها شتی تر •

٢ ـ بە هۆی دانانی سزا لە ڕێگەی (حد)ی شەریعەتەوە سزا (حد)ی داوێن پیسیو بوختانو خواردنەوەی مەی : ئەمجا دامو دەزگای ئیسلام فراوان تر دەبێتو پەیوەندی نێوان خزمو دۆست پێك دێنن وە کارو باری نێوانیان بە پێی یاسای ئیسلامی ڕێك دەخات بە شێوەیەکی وا کە ببێتە هۆی بە هێز بوونیو جۆش دانی مێشکیان بە چەند هەستێکی پیرۆز : لە دوایدا ئەم پەیوەندی ڕێك خستنە سەر دەکێشێت بۆ پەیوەندی نێوان دراوسێتی لە دوایدا بۆ نێوان هەموو لایەك بە گشتی • هەر وەکو خوای بالا دەست لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێ :

(اِنَّمَا اْلمُؤْمِنوُنَ اِخْوَةٌ)

واتە : بە ڕاستی بڕواداران بران •

وه سەرەڕای ئەوەش یاسای ئیسلام وەنەبێ مافی (اهل الذمة)ی پشت گوێ خستبێ کە لە خاکی ئیسلامدا دەژین ، وە هەروەها وە نەبێ ئەو ئەرکانە پشت گوێ بخرێن کە زانایانی شەرع بۆ ( اهل الذمة ) دیاریان کردوە ، لەم گوتەیەدا (قاعدە) کە دەفەرموێ •

( لَهُمْ مَا لَنَا وَعَلَيْهِمْ مَا عَلَيْنَا ) •

واتە : ئەوەی بۆ ئیمە هەیە بۆ ئەوانیش هەیە وە ئەوەی لە سەر ئیمەیە لە سەر ئەوانیشە •

وە لە دوایدا باسی رژێمی ئابووری ئیسلامی دەکەین‌و ڕوونی دەکەینەوە کە تا چ ڕادەیەك جیاوازی لەگەڵ ڕژێمی سەرمایەداری‌و ئیشتراکی‌دا هەیە ، وەچۆن ڕژێمێکی مام ناوەندی‌یەو ، هەڵ قوڵاوی بیرو باوەڕی ئیسلامی‌و بۆ چوونی ئیسلامە بۆ ژیان • وە مەبەستی ژیان‌و سەروەت‌و سامان‌و نرخی‌و چۆن سامان دەوری خۆی لە ژیان‌دا دەبینێ ، وە بۆ دیاری کردنی پیشەی مرۆڤ لە سەر ئەم زەوی‌یە • جا بە پێی یاسای ئیسلام هەموو ماڵ‌و دارایی موڵکی خوایەو ، خوا خاوەنیەتی ، وە مرۆڤیش جێ نشینی خوایە لە سەری •

لە بەر ئەوە پێویستە لە سەری کە پەیڕەوی چەند مەرجێکی شەرعی بکات بۆ وەدەست هێنانی هۆیەکانی دەرامەتی ، وە هەروەها پەیڕەوی شەریعەت بکات لە خەرج کردن (انفاق)ی ماڵ‌دا : دیسان ئایینی ئیسلام بەشێکی تایبەتی لەو ماڵە بۆ هەژارو پەك کەوتان دیاری کردووە ، جا بەم شێوەیە دان بە مافی خاوەنی‌یەتی تاك دادەنێت‌و ڕێزی لێ دەگرێت‌و دەبێتە هاندانی تاك لە سەر کار کردن‌و ڕاهێنان‌و بەرهەم هێنان ، وە لە هەمان کاتیش‌دا مافی کۆمەڵیش لەو سامانە دەپارێزێت • وە ئایینی ئیسلام هیچ کاتێك دەرگای هۆیەکانی وە دەست

هێنانی بەرهەمو ڕۆزی دا ناخات بەرامبەر بە هیچ کەسێك ، مادام لـە ڕێـگەیەکی دروستو ڕەواوە وە دەستی بخات ، کە ئەمە دەبێتە هۆی مسۆگەر کردنی یەکسانی لـە دەرفەتو تێکۆشان بەرامبەر تێـکڕای کۆمەڵ ، بەڵام دان نانێت بە یەکسانی بوونی ڕۆزی لە ناو کۆمـەڵی ئادەمیزاددا چونـکە ئەمە دژی سروشتی مرۆڤو پێچەوانەی دادگەری‌یە سەرە ڕای ئەوەی کە دەبێتە هۆی بە فیڕۆ دانـی ووزەی مرۆڤو دوا خستنی بەروبوومو وەستانی جمو جۆڵو چالاکی ئابووری •

یان بەلای کەمەوە دەبێتە هۆی سست بوونی بەرووبووم لـە بەر نەبوونی هاندەری تاکە کەس ، وە یاسای ئابووری ئیسلامی جیـاوازی نی‌یە لەگـەڵ یاساکانی تری ئیسلام ، وە پەیوەندیشی بە باوەڕو بە یاسای ڕەوشتی‌و دەستوور دانانو کۆمەڵایەتی‌یەوە هـەیە ، بەڵـکو تەنانەت پەیوەندی بە لایەنی گیانیشەوە هەیە ، پەیوەندیەکی بە هێزی وا کـە لە تواناداا هەبێت پێش بڕکەیی لە نێوانیاندا لە سەر بنچینەی سۆزو پشت بە یەکتر بەستن بەرپا بکات وە برایەتی بخاتە نێوان بەرژەوەندی تاكو کۆمەڵەوە ، وە لایەنی مـاددی‌و گیانی لە کاتی بەخشینی زەکاتو خێردا دەرکەوێ‌و بە یەکیەوە ببەستێتەوە • وە ئەو یاسایە تەنها پشت نابەستێت بە تاکە شەخسی بۆ هەڵسان بە کۆ کردنەوەی ماڵی زەکات ، بەڵـکو پێویستی دەکات لە سەر دەوڵەت کـە هەڵبستێت بەم کارە پیرۆزە ، کاتێك کـە زەکات نەدان لە ناو خەڵکدا ڕوی‌دا ، وە ئەو جەنگانەی کـە بە هۆی نەدانی زەکاتەوە لە سەرەتای ئیسلامدا ڕووی‌دا وە نەبێ لای هیچ کەسێك پەنهانو شار دراوە بن • وە لە کۆتایی‌دا یاسای گیانی (روحی) دەخەینە ڕوو ئەو یاسایەی کە پەیوەندی نێوان بەندەو خوا ڕێك دەخات وە ئەو پلانە دەخاتە ڕوو کە ئینسان دەتوانێت پێ‌ی‌دا سەر کـەوێت بۆ

ترۆیکی مرۆڤایەتی‌و ئەویش بە هۆی گەیشتنی بە پلەی (ئیحسان)[1] بە شێوەیەکی وا بەندایەتی خوا بکات وا بزانێت کە خوای گـــــەورە چاوەدێری دەکات‌و دەیبینێت ، وە هەروەها ئەو یاسایە ڕوونی دەکاتەوە کە ئەم ڕژێمـــە چۆن دەتوانێت زاڵ بێت بە سەر ئەو هەموو بۆ چوون‌و خوو خدە نالەبارو نامۆیانەی کە لە ناو خەڵکی‌دا باون‌و وای بۆ دەچـــن کـــە گوایە :

گیان‌و لاشە دوو شتی دژ بە یەکن وە دنیاو قیامەتیش دوو دووژمنی یەکترین‌و ناگونجێت بۆ ئینسان کە هەردووکیان بە یەکەوە لە یەك کات لە کاروانی ژیانی‌دا کۆ بکاتەوە .

چونکە گەیشتن‌و بە دەست خستنی یەکیان دەبێتە هۆی پشت گوێ خستن‌و وێران کاری (وێرانکردنی) ئەوی دیکەیان !! : هەو ئـــەو بۆ چوون‌و تێڕوانینە بوو کە بوو بە هۆی جیا کردنەوەی ئایین لە دەوڵەت وە دوورکەوتنەوەی بەرەی ئادەمیزاد لە خووو ڕەوشتی بەرزو پیرۆز .

بەڵام ئاینی پیرۆزی ئیسلام توانی چارەسەری ئەم مەسەلەیە بـکات بە هۆی دانانی بۆ چوون‌و یاسایەکی ڕاست‌و ڕەوا بۆ خوا پەرستی ، وە ئەو یاسایەش هەموو لایەنەکانی چالاکی مرۆڤ بگرێتەوە لـــە هەموو بوارەکانی ژیاندا ، لە قسەو گوفتـــارو هـــەست‌و کردەوەکانی تاك‌و کۆمەڵدا ، تا لە ئەنجام‌دا ئەم یاسایە شوێنەوارەکەی لە سوچی مزگەوتەوە گوێزرایەوە بۆ گۆڕەپانی ژیان ، وە هەر ئەم یاسایەش بوو کـــە فەرمانی کرد بە کۆمـــەڵی موسڵمانان کە گرنـگی بدەن بە لایەنەکانی ژیان بۆ ئەوەی هەر ئەوان خاوەن پلەو پایەو دەسەڵاتدار بن تا ئەمەیە ڕێـگای بە

---

(١) لێرەدا (احسان) مەبەست بەرزترین پلەی بڕوایە
وەرگێڕ

خوا گەیشتن ، هەر وەکو خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرموێت :

( وَابْتَغِ فِيمَا آتَاكَ اللهُ الدَّارَ الْآخِرَةَ وَلَا تَنْسَ نَصِيبَكَ مِنَ الدُّنْيَا وَأَحْسِنْ كَمَا أَحْسَنَ اللهُ إِلَيْكَ وَلَا تَبْغِ الْفَسَادَ فِي الْأَرْضِ إِنَّ اللهَ لَا يُحِبُّ الْمُفْسِدِينَ ) •

واتە : لەوەدا کە خوا پێی بەخشیوی ژیانی دوا ڕۆژت ڕەچاو بکە(١)و بەشی دنیاشت لە یاد مەکە ، وە چاکە بکە هەروەك چۆن کە خوا چاکەی لە گەڵدا کردوویت ، وە بە دوای خەراپەکاری‌وا مەگەڕێ چونکە خوای گەورە خەراپەکارانی خۆش ناوێ •

ئینجا هەستاین بە خستنە ڕووی چوار پایەکانی ئیسلام‌و عیبادەتە گەورەکان وەك : نوێژو ، زەکاتو ، ڕۆژوو ، حەج ؛ وە ئاماژە بۆ هێندێك لە حوکمەکانیان دەکەین •

وە ئەم یاسا گشتی‌یە بۆ ژیان جیاوازی‌یەکی یەکجار ئاشکرای هەیە لەگەڵ یاسا دەست کردەکانی دیکە ، هەر وەك چۆن لەمەو بەر هەندێکمان خستنە ڕوو : وە لەمەو دواش هەندێکی دیکەتان بۆ دەخەینە ڕوو • ئەم یاسایە هۆیەکانی چەسپاندنی لە خودی خۆیدا مسۆگەر دەکات ئەمەش لە بەر ئەوەیە چونکە یاسایەکی خوایی‌یە هەر خۆی ئاگادارو چاودێریەتی ، وەمسوڵمانانیش بە شێوەیەکی ڕێك‌و پێك مل کەچن بۆ چەسپاندنی •

سەرەڕای ئەوەش کە خوای گەورە سام‌و هەیبەتی تێدا دروست

---

(١) واتە ژیانی دنیاو نیعمەتەکانی بکە بە پەیژەی گەیشتن بە ڕەزامەندی خواو ژیانی دوا ڕۆژ •

وەرگێڕ

کردووە ، چونکە ئەو خوایەی کـە ناردوویەتی‌یە خوارەوە هەر ئەویشە کـە چاوەدێری دەکات‌و ، هیچ شتێکی لێ وون نابێت نە لە ئاسمان‌و نە لـە زەوی ، ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە مل کەچی‌یەکی تەواوی بۆ بکرێت بە پەنهان‌و بە ئاشکرا • ئەو یاسایە باسی هەموو پێویستیەکانی ئادەمیزادی کردووە ، وە هیچ شتێکی پشت گوێ نەخستووە هـــەر لە بچوکترین شتەوە تاوەکو گەورەترین شت ، وە هیچ لایەنێك لە لایەنەکانی ژیـــان نەماوە کە یاسایەکی سەر بەخۆی بۆ دانەنابێت •

بە ڕاستی ئـــەو یاســـایە یاسایەکی گشتی‌یە بۆ هەموو بەرەی ئادەمیزاد بەبێ ئاوڕدانەوە بۆ لای ڕەگەزو ڕەنگ‌و نیشتیمان •

شوێنەواری گشتی‌یەتی ئـــەو یاسایە بریتی‌یە لە پاراستنی تاك‌و کۆمەڵ لە خرابەی پچڕ پچڕ بوونی گیانی‌و کۆمەڵایەتی لـە ئەنجـامی سـەر هەڵدان‌و زۆر بوونی ئەو یاساو سەرچاوە دەستکردانە پەیدا دەبن بۆ ڕێك خستنی کارو باری ژیان هێنراونە کایەوەو ، دەبنە هـۆی لێك پچڕان‌و دوژمن کاری‌و لێك دان هەر وەکو ڕوون‌و ئاشکرایە دژایەتی کردن لەگەڵ بنچینەکانی خوو ڕەوشت‌و دروشمەکانی ئایین‌دا سزایەکی دەروونی‌و ئازارێـکی سەخت پەیدا دەکات ، بەڵام لە کاتێکدا یاســـای ئیسلامی لۆمەو ســـەر زەنشتی دەروون پسی دەکـــات‌و ، ئاشتی‌و ، ئاسوودەیەکی ناو خۆی لە جێگەدا دادەمەزرێنێت •

ئەوەش بە هۆی دەرچوونی هەموو یاسایەك لە لایەن یەك یاسا دانەری ڕاستە قینەوە کە کار بەجێ ترین کەسە ، ئەویش خـــوای پەروەدگارە • هەروەهـا ئاینی ئیسلام هـەڵدەستێ بـە بڵاو کردنەوەی ئاشتی لە ناو کۆمەڵ ، ئەوەش بە هۆی یەکخستنی یاسای ژیان لە ســەر چاوەی‌و کار بەجێی‌و مەبەستێکی ئەوتۆ کە دەبێتە هۆی بەرو بوی خوا

به یەك ناسین ، وە خوای گەورە لـەم بارەیەوە نموونەمان لـە قورئانە پیرۆزەکەیدا بۆ دێنێتەوە کە دەفەرموێ :

( ضَـرَبَ اللهُ مَثَلاً رَجُـلاً فيهِ شُرَكَـاءُ مُتَشَاكِسونَ وَرَجُلاً سَلَمَاً لِرَجُلٍ هَلْ يَسْتَويانِ مَثَلاً اَلْحَمْدُ لِلهِ بَلْ اَكْثَرُهُمْ لاَ يَعْلَمونَ ) .

واتە : ( خوا نموونەیەکی هێناوەتەوە : پیاوێك چەند هاوبەشی دژ بە یەکی تێدا بەشدارن ، وە پیاوێك تایبەتە بە یەکێکەوە ، ئایا یەکسانن ، سوپاس بۆ خودا بەڵکو زۆر بەیان نازانن .

وە ئێمـە لە کاتێك‌دا کە ئەم کتێبە دەخەینە بەردەست خوێنـەرانی بەڕێز لە خوای بالاّ دەست داوا کارین کە موسڵمانان بتوانن کـەڵك‌و سوودی لێ وەربگرن‌و ، ڕێنمایمان بـکات بۆ لای بەرزی ئاینەکەمان‌و دەوڵەمەندی کەلەپورەکەمان و بەرزی ڕێبازەکـەمان ، وە هەست بـە چەسپاندنی ئەم یاسا پاکە لـە هەموو کاروباری ژیانماندا ، وەببێتە هۆی ڕزگـار بوونی موسڵمانان لە چنگ ئەو هەموو یاسا دەستکردە پووچانەی کە بە سەریان‌دا سەپێنراون ، تاوەکو دەگەنە ئەو پلەو پایە بەرزەی کـە خوا لە قورئانی پیرۆزدا مەدحی کردون کە دەفەرموێ :

( كُنْتُمْ خَيْرَ اُمَّـةٍ اُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُـرُونَ بِالْمَعْروُفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنْكَرِ وَتُؤْمِنونَ بِاللهَ ) .

واتە : ئێوە باشترین گەلن کە وەدی هاتوون بۆ خەڵکی بۆ فەرمان کردن بە چاکەو قەدەغە کردنی خراپە ، وە باوەڕتان بە خوا هـەیە . هەروەها فەرموویەتی :

( يَا اَيُّهَا الذَينَ آمَنوُا اُدْخُلوُا في السِلْمِ كَافـةً وَلاَ تَتَبِعوُا خُطُواتِ الشَيْطَان ) •

واته : ئەی بڕواداران هەمووتان بچنە ناو ئاشتی‌یەوە[1] وە شوێن هەنـگاوەکانی شەیتان مەکەون •

وە لێرەدا نابێ ئەوەش لە یاد بکەین کە لە خوای گەورە داوا بکەین پاداشتی نووســەری خەبات گێڕی ڕێبازی ئیسلام بداتەوە بە باشـترین پاداشت وە هەروەها ئێمەش داوا کارین کە هەموو هەوڵو تێکۆشانێکمان تەنها بۆ ڕەزامەندی پەروەردگار بێت •

لە کۆتایدا سوپاسو ستایشی بێ پایان بۆ خوای پەروەردگارمان •

---

(١) لێرەدا مەبەست خۆ تەسلیم کردنی بەرنامەی خودایە ، چونـــکە ئاشتی‌و خێرو خۆشی هەر لە شوێن کەوتنی ئایینی خوا دایە • وەرگێڕ

# یاسای ڕەوشتی

هەستی خوو ڕەووشتی لە نێو ئادەمیزادا هەستێکی سرووشتی‌یە ، خــوای گەورە خستویەتی‌یە نێو دڵو دەروونی مرۆڤەوە کە پاڵی پێــوە دەنێت بۆ خۆشــەویستی هێنــدێك سیفاتی ئینسانو ڕق لێ بوونەوەی هێندێکی دیکە •

وە ئەو هەست کردنە هەرچەندە جیاوازەو ، ڕاددەیەکی جۆراو جۆری هەیە بە گوێرەی تاکەکانی ئادەمیزاد ، بەڵام هەستی گشتی ( بــە بێ ئاوڕ دانەوە بۆ لای تاکەکان ) بەردەوام بڕیار لە ســەر هــەندێك کردەوەو ، هەڵس‌و کەوت بە باشی دەداتو ، وە لە سەر هێندێکی تر بە خراپی لە هەموو دەورو زەمانێکدا ، بۆ نمونە : ڕاست گۆیی‌و دەست پاکی‌و دادگەری‌و پەیمان بردنە سەر ، ئەمانە هەموویان مرۆڤایەتی بــە ڕەوشتێکی بەرزیان دەداتە قەڵەم کــە شایەنی مەدح‌و ستایش کردن بن لە هەموو چەرخێك لە چەرخەکانی ژیان ، وە لە هیچ کاتو شوێنێکدا نەبووە کە ئینسان درۆو ، زۆرداری‌و ، ستەم کاری‌و ، ناپاکی بــە باش بزانێت ، وە یەکسانی‌و بەزەیی پێکدا هاتنەوەو ، دڵ فراوانی‌و ســینگ فراوانی‌و ، لێ بوردن ، ئەوانە هەموویان لــەو شتانەن کــە ئادەمیزاد بە چاوێــکی ڕێزو پیرۆزەوە لە هەموو شوێنێکدا تەماشایان دەکات ، بــە پێچەوانەی خۆ هەڵدانەوەو ، لە خۆبای بوونو ، دڵ ڕەقی‌و ، ڕژدی‌و ،

چـاو چنۆکی ، مرۆڤایەتی هیچ کاتێك بە چاوی ڕێزو پیرۆزەوە سەیری ئەمانەی نەکردووەو نایـکا ، ئینجا مرۆڤایەتی بەردەوام ڕێزی ئـــارام گرتن‌و هێمنی‌و ، خۆ ڕاگرتن‌و ، هێواشی‌و ، پایە بەرزی‌و ، ئازایەتی‌و ، مەردایەتی دەگرێت‌و ، بە چاوی ڕێزەوە بۆیان دەڕوانێت ، هــــەروەکو بەردەوامیش بە چـاوی سوکەوە سەیری بێ ئارامی‌و ، خۆ ڕانەگرتن‌و ، هەل پەرستی‌و ، ترسنۆکی دەکات ، هەروەها مرۆڤایەتی بەردەوام دابین کردنی هــەواو ئارەزوو ، هاودەمی‌و ڕەوشت بەرزی‌و ، هۆگری کردن لەگــەڵ مەردووم بە ڕەووشتێکی بەرزو پیرۆزی دادەنێت بەڵام بـــە دواکەوتنی هەواو ئارەزوو ڕەووشت نزمی‌و ، بێ ئەدەبی‌و ، خوخـدەی خراپ ، مرۆڤایەتی هیچ کاتێك ڕێزی بۆ ئەمانە دانەناوە ، وە هەروەهـا مرۆڤایــەتی بەردەوام ئەندازەی جێ‌بەجێ کردنی ئــەرکی سەرشان‌و ، پاراستنی پەیمان‌و ، چالاکی لە کار کردن‌داو ، هەست بە لێپرسراوی ڕوون دەکاتەوە ، هەروەکو مرۆڤایەتی هیچ کاتێك بە چاوی ڕێزەوە سەیری ئەو کەسانە ناکات کــە ئەرکی سەر شانیان جێ بەجێ ناکــەن ، وە پەیمان‌و بەڵێنەکانیان نابەنە سەرو ، وەئیش‌و کاری سەر شانیـــان بە ڕێك‌و پێکی ئەنجام نادەن .

ئا ئەو سیفەتانەی کە باسمان کردن هەموویان سیفەتی تاکین ، بەڵام کارو باری کۆمەڵایەتی بەکردەوە چاکەکانی‌و خراپەکانیەوە ، وە بـــە سیفەتە بەرزەکانی‌و نزمیەکانیەوە بەردەوام مرۆڤایەتی بە یەك چاو بۆیان دەڕوانێت ، وە بە یەك تەرازوو دەیان کێشێ . تاوەکو ئێستا نەزانراوە لە ناو کۆمەڵگاکانی مرۆڤایەتی‌دا هیچ کۆمەڵگایەك هەبێت کـــە شایانی گەورەیی‌و ڕێز لێ گرتن بێت تەنیا ئەو کۆمەڵە نەبێت کە خاوەنی خــوو ڕەوشتی جوان‌و یاسای ڕێك‌و ، پێك بێت‌و ، ئالای یارمەتی‌و ، تەواوی‌و

خۆشەویستی‌و ، ئامۆژگاری‌و ، دادپەروەری کۆمەڵایەتی‌و ، یەکسانی لە لە سەر بشەکێتەوە • بێگومان مرۆڤایەتی هیچ کاتێك بە چاوی ڕێزەوە ، سەیری ئەو کۆمەڵگایە ناکات کە بە تەونی پچرپچری جاڵجاڵۆکەوە پەرتەوازەیی‌و ، ئاژاوەو ، گیرەو ، کێشەو ، تێك چوونی بارو ، دۆخ‌و کینە بەرایەتی‌و ، لێك دوور کەوتنەوەو ، چاو چنۆکی‌و ، خراپ کاری‌و : خۆ بە زل زانین لە بەینی تاکەکانی کۆمەڵدا داپۆشرابێت ، وە هەروەها کارو باری خوڕەوشتی بە چاك‌و خراپیەوە بەردەوام ماوەتەوە لە سەر هەمان شێوە کە لە هەموو کات‌و ، سەردەمە پێشوەکاندا لە سەری بووە •

مرۆڤایەتی بە چاوی ڕێزەوە سەیری کردەوەی دزی‌و داوێن پیسی‌و کوشتن‌و قۆڵ بڕین‌و تەڵەکە بازی‌و بەرتیل خواردن‌و ئازار دانی خەڵکی‌و پاش ملە باس کردنی خەڵکی‌و دووزمانی‌و بوختان بلاو کردنەوەو خراپەکاری لە سەر زەوی ناکات •

هەروەکو کە بە چاوی ڕێزەوە سەیری چاکە لەگەڵ دایك‌و باوك‌و خزم‌و کەس‌و کارو ڕێز گرتنی دراوسێ‌و برادەرو یارمەتی دانی برادەر لە سەر شتی ڕەواو سەر پەرشتی کردنی پێویستی‌یەکانی هەتیوان‌و هەژاران‌و چونە لای نەخۆشان‌و یارمەتی دانی لێقەوماوان‌و دەست گرتنی یەك کەوتوان دەکات •

هەروەها بە چاوی ڕێزەوە سەیری ئینسانی فێڵ بازو ناشوکرو دەم درێژو ڕیا بازو دوو ڕوو تەماع کار ناکات • کەچی لە هەمان کاتدا ڕێزی لە مرۆڤی داوێن پاك‌و ئاکار بەرزو سروشت خاوێن‌و دەست پاك ناوە • پوختەی قسەکەمان ئەوەیە کە مرۆڤایەتی لە هەموو کاتێکدا ئەو کەسانەی بە مرۆڤی ژیرو ڕێك‌و پێك داناوە کە لە گوفتارو

قسەکانیاندا ڕاست گۆ بوونەو باوەڕ پێکراوی ناو خەڵك بوون‌و کۆمەڵ پشتی پێ بەستونە لە هەموو کارو باسێکدا •

وە دە ڕەوەو ناوەوەیان قسەو کردەوەیان وەك یەك بووە • وە ئەو کەسانەی کـە بە بەش‌و چارە نووسی ڕازین‌و پێش بڕکێ‌یی دەکەن بۆ جێ بەجێ کردنی ئەرکی سـەر شانیان بەرامبەر بە خۆیان‌و خەڵـکی دیکە وە ئەو کەسانەی کـە ژیان دەبەنە سـەر بە چەشنێکی ئاسایش‌و کامەرانیەوە خەڵکیش لـە دەست‌و زمانیان دڵ نیان ، ئا ئەمانە بێجگە لـە چاکەو مەردایەتی شتێکی دیکەیان لێ چاوەڕوان ناکرێت •

لێرەدا دەردەکەوێت کـە بنچینەکانی خوو ڕەووشت چـەند ڕاستیەکی چەسپاوی جیهانی‌یە بەردەوام هـەموو نەوەکـانی بەرەی ئادەمیزاد شارەزایی‌یان پێ‌ی هەیە ، وە چاکـەو خەراپەش شتێك نیە کە لە هیچ کەس پەنهان‌و شاردراوە بێت ، تاوەکو پێویست بە لێکۆڵینەوەیان بـکات ئەگەر ویستیان بۆیان ڕوون بـکرێتەوە ، بەڵـکو خوو ڕەووشت ئاکارێـکە کە بەرەی ئادەمیزاد هەر لە سەرەتای پەیدا بونیەوە خوا ئەم هەستەی پێ بەخشیوەو خستویەتیە ناو دڵ‌و دەرونیەوە ، هەر لە بـەر ئەوەشە دەبینین کـە قورئانی پیرۆز کردەوەی باشی بەچاکە ناو بردووەو کردەوەی ناپەسندیشی بە خەراپە ناو بردووە ( الخیر بالمعرف والشـر بالمنکر )وە مەبەستی قورئان لێرەدا ئەوەیە کە چاکە بریتی‌یە لـەو شتەی کـە ئادەمیزاد ئارەزووی بۆ لا دەکات‌و خووی پێوەگرتووە وە خراپەش بریتی‌یە لەو شتەی کـە خەڵك بـە ناڕەوای دادەنێت‌و قێـزی لێ دەکەنەوەو بە چـاوی سووك سەیری دەکەن ، هەروەکو چۆن دەبینین کە خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا لەم بارەیەوە فەرموویەتی :

( فَأَلْهَمَهَا فجُورَهَا وَتَقْوَاهَا ) •

مەبەستی لە نەفسی ئادەمیزادە ، مانای ئەوەیە کە خوای گەورە بە سروشت ئاکاری چاكو خراپی خستۆتە ناو دڵو دەروونیو وا دەبێت کە خوێنەر لەم شوێنەدا پرسیار دەکاتو دەڵێ :ـ ئەگەر بەردەوام خوو ڕەوشتی باشو تەواو لە ناو خەڵکدا ناسراوەو لە جیهاندا بڕیاری لە سەر دراوەو بەردەوام خەڵکی سەر زەوی هەر لەو کاتەوە کە سەر زەویان ئاوەدان کردۆتەوە لە سەر یەك ڕا بوون ، دەربارەی باشیو چاکی هەندێك سیفاتیو خراپیو بێ کەڵکی هەندێك سیفاتیتر .

کەواتە ئەو هەموو یاسا ڕەوشتیە جیا جیایانەی جیهان بۆ داهێنراون ؟ چ شتێك دەبێتە هۆی بوونی جیاوازی لە نێوانیانداو لێکی جیا کردوونەتەوە ؟

وە چ بەڵگەیەکمان بە دەستەوەیە بۆ پشت پێ بەستن کە دەڵێن : ئاینی ئیسلام یاسایەکی تایبەتی خوو ڕەوشتی هەیە ؟ وە لە دوایدا ئەو سیفەتانە چین کە وای کردووە ئاینی ئیسلام ببێتە سەر پشك لە نێوان هەموو یاساکانی جیهاندا ، کە بەردەوام تاکو ئێستاش ڕاستییەکی ڕوونو ئاشکرا بووە لە مێژووی ڕێبازی ڕەوشتیدا ، وە گەوهەرێکی بەهادار بووە لە سەر سەری تاجی مرۆڤایەتی ؟ ئەگەر بێتو چاوێك بە یاسا ڕەوشتییە جیا جیاکان لە جیهاندا بخشێنین بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم مەسەلەیە لە یەکەم هەنگاودا بۆمان وەردەکەوێت کە ئەو یاسانە هەر لە بنەڕەتدا جیاوازیان هەیە لە شێوەی پێك هاتنی یاسا ڕەوشتیەکاندا لە دیاری کردنی سنورەکانیو پلەو پایەو شوێنی بە کار هێنانو یەکخستن لە نێوانیاندا ، جا ئەگەر بە قووڵی بۆی بچینو بە وردی سەیری بکەین هۆی ئەم جیاوازییەمان بۆ دەر دەکەوێ ئەویش کە : ئەو یاسایانە جیاوازیان هەیە دەربارەی دیاری کردنی پێوەرێك (معیار)بۆ

چاکەو خراپە لە ڕەوشتدا کە هۆیەکە بۆ ڕوونکردنەوەو جیا کردنەوەی چاکە لە خراپە ، هەر وەك چۆن یەك ناکەون لە سەر بڕیاردانی هێزێکی جێ بەجێ کەر کەوا لەو دیو یاساوە کارەکانی خۆی جێ بەجێ دەکاتو وای لێ دەکات کە بچێتە ناو خەڵکەوەو دەست نیشانی ئەو هەڵەیە بکات کەوا لە مرۆڤ دەکات شوێنی یاسا بکەوێو لە سەری بەردەوام بێ ، لە دوایدا ئەگەر لە هۆی جیاوازی ئەو یاسایانە بکۆڵینەوە وە بە تێڕوانینێکی ووردەوە سەرنجی بدات هەقیقەتو ڕاستەقینەی بە ئاشکرا بۆ دەردەکەوێت کە :ـ ئەوەی ڕێگای ئەو یاسا دەست کردانەی بە شێوەیەکی گشتی نابووتو بێ ڕەواج کردوەو لە یەکتری دوور خستوونەتەوە ئەوەیە : کە ئەو یاسایانە جیاوازییان لەگەڵ یەکتری‌دا هەیە لە بۆ چوونیان دەربارەی ئەم بوونەوەرەو ئەو پلە فراوانەی کە لە یاسای ژیان‌دا هەیە ، وە دەربارەی مەبەستی ژیانی مرۆڤایەتی لە بوونەوەردا ، وە هەر ئەم جیاوازی‌یە بوو کە کاری تێ کردبوو بە هۆی پەیدا بوونی جیاوازی‌یەکی بنەڕەتی لە ماهیەتو سرووشتو کارو بارەکانیدا • ئەو مەسەلانەی کە بناغەی ژیانی مرۆڤایەتی لە سەر دامەزراوە ، وە دیاری کردنی هەڵوێستو بیرو بۆ چوونەکانی ژیانی مرۆڤ لە دونیادا دیاری دەکات • ئەوەیە : ئایا ئەم بوونەوەرە هیچ دروست کەری هەیە یان نا ؟ ئەگەر هەیە ئایا خوایەکی بە تەنهایە یا چەند خوایەکی دیکەشی لەگەڵ هاوبەشن ؟ وە ئەو خوایەی کە ئێمە لە ناو هەموویاندا بڕوامان پێی هەیە کامەیە ؟

وە ئەو سیفەتانەی کە شایستەی ئەون چین ؟

وە ئەوپەیوەندی‌یانە چین کە لە بەینی ئێمەو ئەودا هەیە ؟ ئایا ئەو خوایە مشوری ڕێنمایی‌و جێ بەجێ کردنی کارەکانمانی خواردووە یان نا ؟

ئایا ئێمە بەرامبەر بە ئەو خوایە بەر پرسیارین یان نا ؟ ئەگـــەر ئەوە وایە چ شتێکە کە ئێمە بەرامبەر بە خوا بەرپرسیار دەکات ؟

پاشان ئامانجی ژیانی ئێمە چییەو ئاکامی کارو باری ژیانمان چی‌یە کـــە هەمیشە چاومان تێ بڕیوەو بە گوێرەی پێویستیەکانی ژیانی ئـــەم دونیایە کار دەکەین ؟ ئەوانە چەند مەسەلەیەکی بنچینەیی ترسناکن وەڵام دانەوەیان پێویستی بە دامەزراندنی یاسایەکی ژیانی ئادەمیزادانە دەکات ، کەوابوو یاسای خووڕەوشت دانامەزرێت تەنها بەو شێوەیە نەبێت کـــە لەگەڵ ڕاستەقینەی ئەو وەڵامە نەبێت ؟ وە لەو لێدوانە کورتەدا دەستمان ناڕوات کە بە شێوەیەکی تێرو تەسەل باسی یاسا جیا جیاکانی ژیان لـــە جیهاندا بکەین دەربارەی وەڵامی هەر یەکێك لەو پرسیارانەی کـــە دراونەتەوە لە لایەن یاسا دەستکردەکانی جیهـــاندا ، لـە دوایدا ئەو وەڵامانە چ نیشانەو کارەساتێکیان پەیدا کردوە لە وەڵامەکانیان داو لـــە دیاری کردنی ئەم ڕێـگایانەی کە لە سەری دەڕۆن بەڵام مـــن لە ناو هەموویاندا ئاینی ئیسلام هەڵبژاردوە • بۆ وەڵام دانەوەی ئەو مەسەلانە لە لایەن یاسا دەستکردەکانەوە ، وە هەروەها ڕوون کردنەوەی ئەو یاسا تایبەتیە کە ئیسلام بۆ خوو ڕەوشت هێناویەتیە کایەوە لە سەر بنچینەی ئەو وەڵامەوە جێ بەجێ کردنی پێویستیەکانی ئاینی ئیسلام بۆ وەڵام دانەوەی ئەو مەسەلانە دەڵێت :ـ

ئەم بوونەوەرە خوایەکی هەیەو بێجگە لەو هیچ خوایەکی دیــکە نی‌یە ، هـــەر ئەو خوایەیە کە ئەو بوونەوەرەو هـــەرچی تێـــدایە هێناویەتە کایەوە ، وە هـــەر ئەو هەڵسوڕێنەری کاروباری بوونەوەرەو هیچ هاوبەشێکی لەگەڵدا نی‌یە وە فەرمان دەرکردنو قەدەغە کردن هەر شایستەی ئەوە ، وە هەر ئەو پەروەردگاری ئاسمانەکانو زەوی‌و هەرچی

لـه نێوانیاندا هەیە ، وە ئەو یاسا بوونەوەریەی کە دەبینین بە ڕێــکی دەڕواو هەموو مل کەچی فەرمانو ویستی ئەو خوایەنو وە هەر ئــەو کاربەجێو بە تواناو ئاگادارە بە دیارو نادیار ، ئەو خوایەی کـــە بە ئەندازەی تۆزقاڵێك (گەردیلە)یەك هیچ شتێکی لێ نا شاردرێتەوە نە لـە ئاسمانەکانو وە نە لە زەوی ، وە ئەو پاشاو خاوەن دەسەڵاتەیە کـــە کاروباری لەم بوونەوەرەدا بە ئەندازەیەکی دیاری کراو دەڕوات بـــە ڕێوەو سووکیو کەمو کوڕی نایەتە ڕێــگا ، وە مرۆف بەپێی دروست بوونو فەرمانی سروشتی بەندەی خوایە ، وە لە جیهاندا هیچ پیشەیەکی نییە تەنها ئەوە نەبێت کە بی پەرستێتو مل کەچی بۆ فەرمانەکانی بکات، وە ژیانی ئادەمیزاد هیچ ماناو مەبەستێکی نابێت تەنها کاتێك نەبێت کـــە هەموو ژیانی بەندایەتیەکی پاكو پوخت بێت بۆ پەروەردگاری خـــۆی ، وە شایەنی ئینسان نییە کـــە بە ناو بە ئارەزووی خۆی ڕێبازو بەرنامەیەك بۆ بەندایەتیەکەی دیاری بـکات ئەو بەرنامە دانانە تەنها بۆ ئەو خوایەیە کـــە دروستی کردوەو کردویەتی بە بەندەیەك لە بەندەکانی ، بێــگومان خوای گەورە چەندەها پێغەمبەرانی ( علیهم السلام )بۆ ئینسان ڕەوانـــە کردووەو پەرتوکی خـــۆی بۆ ناردونە خوارەوە بۆ ڕێنمایی کردنو شارەزا کردنیان بۆ ڕێــگای چاكو بەختەوەری ●

ئەمجا کەوا بوو پێویستە لە سەری کە یاسای ژیانی وەر نەگرێت تەنیا لەو یاسا ڕۆشنو درەخشانەی کە خوا بۆی دیاری کردووە ●

وە لە ڕۆژی دوایدا مرۆف بەرپرسیارە بەرامبەر بە پەروەردگاری لەوەی کە لە ژیانیدا پێی هـــەڵ دەستێ ، وە لـــە ڕۆژی دوایدا لێ پرسراوە لە بارەگای خوا ، ئەو جیهانەی کـــە ئێستا تێیدا دەژی وەکو قوتابخانەیەکە بۆ تاقی کردنەوە ، وە پێویستە لە ســـەر مرۆف کـــە

مەبەستێکی دنیایی بۆ ژیانەکەی دیاری نەکات بە شێوەیەکی وا کـــە بەردەوام بێت‌و هەوڵ‌و کۆشش بـکات لە پێناو بەدەست هێنانی‌دا ، بـۆ ئەوەی کە لە دەرچوان‌و سەر کەوتوان بێت لە بەرامبەر پەروەردگـاری لە ڕۆژی دوایدا وە ئینسان بە هەموو هێزو ئەندامەکانیەوە دەچێتە ژێر ئەو تاقی کردنەوەوە ، چونـکە ئەو تاقی کردنەوەیە هەمووی پڕە لـــە سزاو ناڕەحەتی بۆ هـــەموو هێزو ئەندام‌و بەخشیشەکـــانی وە تاقی کردنەوەیە بۆ هەموو لایەنەکانی ژیانی •

بێگومان ئینسان تاقی دەکرێتەوە لەو هەموو هەوڵ‌و کۆششەی کـە لە دنیادا داویەتی ، تاقی کردنەوەیەکی پاك‌و بوخت کە دوورە لە چڵك‌و چەپەڵی ئەم جیهانە ، سەرباری ئەوەی ئەو کەسەی کە هەڵ دەستێ بـەو لێ پرسینەوەیە ئەو خوایەیە کە بە هەموو شتێك ئاگادارە ، وە ئەو خوایەی کـە عیلمەکەی هیچ سنورێـکی نیەو ناوەستێت کاتێك کە کردەوەو جموجۆڵیەکانی مرۆڤ تۆمـار دەکات لـە هەموو لایەنەکانی ئەم بوونەوەرە لـە سەر زەوی‌و لە ناو هەواو ناو بۆشایی‌وە لـــە ناو دڵ‌و مێشك‌و دەست‌و قاچی‌دا •

بەڵـکو عیلمی خوا دەوری هەموو ئەو ڕازو نهێنی‌و هـــەست‌و نەستەی داوە کە بە دڵی ئادەمیزادوا دێت ، وە هیچ شتێکی لە مـــانە لێ ناشاردرێتەوە ، ئا ئـــەوە وەڵامی ئاینی ئیسلامـــە دەربارەی مەسەلە بنچینەکانی ژیان ، وە ئەوەیە بۆ چوونەکانی دەربارەی بوونەوەرو پلـەو پایەی مرۆڤ تێیدا ، وە ئاینی ئیسلام ئەو مەبەستە ڕاستەقینە بـــەرزو پیرۆزە دیاری دەکات کـە پێویستە بێتـــە مەبەستی هـــەرە بەرزی تێکۆشانەکانی مرۆڤ‌و هەوڵ دانی لەم جیهانەدا ( ئەویش کە بریتی‌یە لە ڕەزامـــەندی خـــوای پەروەدگـارو گـەیشتن بە ڕەزامەندی ئەو ) ئا ئەمـــەیە ئـــەو پێـــوەری کـــە لـە پاســای خـوو ڕەووشتی

ئیسلامدا هەموو کردەوەیەك لە کردەوەکانی ئادەمیزادی پێ دەپێورێ‌و بڕیاری چاکەو خراپەی بە سەردا دەدرێ لە دوایدا ئەو دیاری کردنە جەمسەرێك ( تەوەرێك ) بۆ ژیانی ئادەمیزاد دیاری دەکات کە بە ڕێك وپێکی بە دەوری‌دا بسوڕێتەوە ، وە ئەو یاسایە لێ‌ی ناگەڕێت کە ئەو کۆمەڵگایە وەکو کەشتیەکی ناو دەریا ڕەشەبا بەولاو ئەولای دا بدات‌و شەپۆلەکانی دەریا وەری بگێڕێت ، وە هەروەها ئەو دیاری کردنە مەبەستێکی ڕاستەقینە دەخاتە بەردەم ئادەمیزاد کە بەو هۆیەوە بتوانێت بۆ هەموو سیفاتە ڕەوشتی‌یەکان لە ژیان‌دا سنورو پلەو پایەو وێنەیەکی زانستیانە دیاری بکات کە بگونجێت بۆ هەر یەکێك لەو کۆمەڵە . هەروەها ئادەمیزاد لە پێناو ئەو مەبەستە ڕاستەقینەیەدا خوو ڕەووشتێکی سەر بەخۆ بە دەست دێنێ کە بەردەوام لە شوێنی خۆیدا بە پتەوی بمێنێتەوە بە درێژایی ئەو ئاڵ‌و گۆڕیانەی کە بە سەر کارو بارو گوزەرانیان‌دا هاتووە ، سەرەڕای ئەمەش ئەگەر بێت‌و مەبەستی ڕازی کردنی خواو گەیشتن بە ڕەزامەندی ئەو بێت ، وە بیکات بە هەقی سەرەکی هەوڵ‌و تێکۆشانی .

بە ڕاستی خوو ڕەووشتی ئادەمیزاد توانیویەتی بکات بە مەبەستێکی بەرزی وا کە بتوانێت بەرز بێتەوە بۆ پلەیەکی بێ سنوری وا بە هیچ کلۆجێك چڵك‌و پیسی کۆیلایەتی‌و خۆ پەرستی لە هیچ قۆناغێك لە قۆناغەکانی ژیانی‌دا نەبێت : هەر وەکو چۆن ئایینی ئیسلام بەو پێوەرە بەهرەو خۆشیمان بە سەردا دەڕێژێت بە هۆی بۆچونەکەیەوە بۆ بوونەوەرو ئادەمیزاد وە لە هەمان کات‌دا هۆ (وەسیلە)یەکی هەمیشەییمان پێ دەبەخشێ بۆ ناسینی ڕەووشتی چاك‌و خراپ .

وە ئایینی ئیسلام بیرو هەواو ئارەزوو ، تاقی کردنەوەکانی‌و

زانیاریه مرۆڤایەتیەکانی نە کردووە بە سەر چاوە بۆ هەست کردن بـــە چوونیەکی خوو ڕەووشت تاوەکو ئەو چونیەتە بە پێی ئەو چـــوار هۆیانەوە بگۆڕدرێت ، وهیچ بڕیارێکیشی لە سەر نادات بەڵـــکو ئایینی ئیسلام سەر چاوەیەکی بنچینە دامەزراوی وامان پێ دەبەخشێ کـــە شارەزایی هەموو زانستی‌یە خوو ڕەووشتیەکانمان بـکات لـ هەموو کات و شوێنێك‌دا ، بێگومان ئەو سەر چاوەش قورئانی پیرۆزو ڕێو ڕەووشتی پێغەمبەری ( صلی الله علیه وسلم ) مەزنە ، وە ئەو زانیـــاریانە ڕێ نمایی‌مان دەکـــات بۆ ڕاست ترین‌و تەواو ترین ڕێـــگاو نەخشەیەکی ڕاستمان بۆ ڕوونك دەکاتەوە لـــە هـــەموو کارێك لە کارەکانی ژیانمان‌دا هـــەر لە بچوکترین مەسەلەی ناو مـــاڵ تا دەگاتە مەسەلە ڕامیاریە دەوڵەتیەکان‌و گیرو گرفتە سامناکەکـانی ، وە لـــەو زانستیانەدا پەیوەندی‌یەکی فراوان بەدی دەکەین بۆ بنچینەکانی ڕەووشت لە ســـەر کارو بارە جیاجیاکانی ژیان بە شێوەیەکی وا لە هیچ قۆناغێك لە قۆناغەکانی ژیان پێویستمان بە هیچ زانیاری‌یەکی دیـــکە نەبێت •

لە دوایی‌دا لەو بۆچوونەی ئیسلام بۆ ئینسان‌و بوونەوەری دانـاوە ئەو هێزە کاریـــگەرە بەدی دەکەین کە پێویستە یاسای ڕەوشتی پشتی‌پێ ببەستێ ئەو هێزەیەش هێزی لە خوا ترسانە ، وە ترسان لە لێ پرسینەوەی ڕۆژی دوایی‌و ترسان لە دوا ڕۆژێـــکی خراپ‌و لە دوا ڕۆژێـــکی هەتاهەتایی‌دا ، وە گومانی تێدا نی‌یە ئایینی ئیسلام دەیەوێت بارێـــکی گونجاوی وا بهێنێتە کایەوە کـــە تاك‌و کۆمەڵ هان بدات‌و ناچاریان بکات بۆ بنیات نانی بنچینەکانی خوو ڕەووشتی‌و بەردەوام بوون لە سەری •

هەر وەکو چۆن دەیەوێ یاسایەکی ڕامیاری بەرپا بکات بە هـــۆی دەسەڵاتەکەیەوە بتوانێت یاسای خوو ڕەووشتی لە ناو خەڵك‌دا جێ بـــە

جێ بـکات ، بەڵام لە ڕاستیدا ئەوەی کە باسمان کرد ئاینی ئیسلام زۆر پشت دەبەستێت بە هێزێـکی دەروونیو لە سەر چـاوەی بڕوا بوون بە خواو ڕۆژی دوایی هەڵقوڵا بێ ، جا لە بەر ئەوە دەبینین کـە ئاینی ئیسلام پێش ئەوەی فەرمان بـکات بە ئینسان کە پا بەند بێت بە یاسـای خوو ڕەووشت داوای لێ دەکات ترس‌و بیمی خوای لە دڵـدا جێـگیر بێت‌و پەندی لێ وەربگرێ لـە بەر ئەوەی هەموو فەرمانێـکی تۆ دەگەڕێتەوە بۆ لای خوایەکی بینـەرو زانایەکی وا کـە بە ئەندازەی گەردیلەیەك هیچ شتێکی لە زەوی‌و نە لە ئاسمان لێ وون نابێ ، لە هەر شوێنێك بێت دەت بینێت وە تۆ دەتوانی خۆت لە غەیری خوا بشاریتەوە بەڵام هەرگیزاو هەرگیز ناتوانیت خۆت لە خوا بشاریتەوە وە لـە توانای دەسەڵاتتدا هـەیە کە هەر چی ئادەمیزاد هـەیە فریوی بدەی بەڵام بێگومان ناتوانی خوای خاوەن دەسەڵات فریو بدەی • وە دەتوانیت هەر چی لە سەر زەوی دەژیت دەستەوەستانیان بکەیت بەڵام هەرگیز ناتوانیت دروست کـەری ئاسمانەکان‌و زەوی دەستەوەستان بکەی ، وە خەڵـکی سەیری ئەو کردارو ڕەووشتە ڕووالەتیانە دەکەن کە بە چاو دەی بینن بەڵام خوای زانا بە ئاشکراو پەنهان ئاگادارەوو زانایە بە نهێنی دەروون‌و ڕازو نیازی دڵ ، هـەر چەندە لەو ژیانە بڕاوەیەدا کار بکەیت‌و خـۆت مـاندو بکەیت ، هیچ پەنایەك نی یە کە خۆتی لێ پەنهان بکەیت ، لە ترسی چێشتنی شەڕابی مردن‌و گەڕانەوە بۆ بەردەم ئەو دادگایەی کـە هیچ پارێزەرو بەرتیل‌و تـکا کاری‌و شایەتی بە درۆو فێڵ‌و تەڵەکە یەك ، نـا توانن‌و بە فریات بێن لـە ڕۆژێكدا کـە خوای باڵادەست تەرازووی ڕاستی‌و دادگەری دادەنێت‌و ، پاداشتی هەموو بەندەکانی دەداتەوە پڕ بە پڕی کردەوەکانیان • ئاینی پیرۆزی ئیسلام ئەم بڕوا بوونە ( بڕوا بوون بە خواو ڕۆژی دوایی ) لە دڵی ئادەمیزاددا دەچەسپێنێ بە شێوەیەك کـە

وا بزانێ هەمیشە پاسەوانێکی خوو ڕەووشتی وا بە سەریەوەو پاڵی پێوە دەنێ بۆ کارکردنو هەڵی دەنێ بۆ قەبووڵ کردنی فەرمانەکانی خـوای گەورە ، وە بوونی ئەو هۆیەی کە پاڵی پێوە دەنێ بۆ هەڵسان بە کارەکە یەکسانە لە لای ، جـا ئەو پاڵ پێوەنەرە چ لە دەرەوەی پۆلیسخانەو دادگاو بەندی خانەبێ یان نا • وە ئەو پاسەوانە ناوەکی‌یە ئەو پاڵ نـەرە دەروونیەیە کـە بازووی یاسای ڕەوشتی ئیسلام بە هێز دەکات بۆ ئەوەی لەناو کۆمەلدا جێ بە جێ بکرێت وە ئەگـەر بێتو لەگـەڵ ئەو پاڵنەرە دەروونی‌یەرا لایەنگری‌و پاڵ پشتی‌و دەسەڵاتو ڕای گشتی لەگـەڵ دابێت کە ببێتە هۆی ئاسان کردنی جێ بە جێ کردنی ئەوا چـاکترو باشتر ئەگینا لە ڕاستی‌دا هەر ئیمـان بە تەنیـا دەتوانێ ڕێنمایی تاکی مسوڵمانو گەلی مسوڵمان بـکات بۆ ڕاست ترین ڕێـگا ئەگـەر بێتو بڕوای گەشنوە تێکەڵاوی ناو دڵو دەروونیان بێتو ئەو بیرو بڕوایە لـە ناو دڵیان‌دا چەسپا بێتو چووبێتە قووڵایی دەروونیان،سەرەڕای ئەوەش ئەو بۆچوونەی ئیسلام بۆ بوونەوەرو ئادەمیزاد چەند پاڵنەرێك ئامادە دەکـات کـە مرۆڤ هان دەداتو پاڵی پێوە دەنێ بۆ کار کردن بە پێی داخوازی یاسای ڕەووشتی ، وە بەسە بۆ مرۆڤ پاڵنەرێـکی هەبێ بۆ مل کـەچ کردنو بۆ گەیشتن بە ڕەزامـەندی خواو ، جـێ بە جـێ کردنی فەرمانەکانی‌و ڕازی بێت بـە خوایەتی خواو بەندایەتی کردنی بۆی‌و ، ڕۆیشتن لە سەر ڕێبازەکەی لە ژیانیدا وە هەروەها ڕەزامەندی خواش بکات بە ئامانجی سەرەکی ژیانی •

وە کاریگەرێکی دیکە کە دەبێتە پاڵپشت بۆ کاریگەرەکەی پێشـوو بە هێزی دەکات ، بڕوا بوونە بە ڕۆژی دوایی وە بڕوای وا بێت هـەر کەسێك مل کـەچی خوا بێتو فەرمانەکانی خوا جێ بە جێ بکات دوایی ئەوە تووشی خۆشبەختی‌و سەرکەوتن دەبێت لە جیهانی دوایی هـەتا

هەتایبدا (الآخرة السرمدیة)و ئەو کەسە دەگات بە ژیانێکی خۆش‌و دوا ڕۆژێکی گەشاوەو نازوو نیعمەتێکی نەبڕاوەو بەردەوام ، هەر چەندە لەم دنیا بڕاوەیەدا تووشی جۆرەها ئازارو ئەشکەنجەو دڵتەنگی‌و ناڕەحەتی بووبێت ، • بەڵام ئەگەر بێت‌و لەم جیهانەدا ژیانی بە سەرپێچی کردنی فەرمانەکانی خوا بەرێتە سەر ئەوا هیچ گومانی تێدا نی‌یە کە سەرەنجامی ئەو کەسە لە ڕۆژی دوایی‌دا تۆڵەیەکی سەخت‌و سزایەکی هەمیشەیی‌یە ، هەر چەندە لە ژیانی دونیادا لەو پەڕی خۆشی‌و لە جۆرەها نازو نیعمەت‌و ڕابواردن‌دا بوو بێت • ئەگەر ئومێدو ترس لە خوا لە ناو دڵی کەسێکدا کۆ بوونەوەو لە قوڵایی دەروونیا جێگیر بوون وەکو ئەوە وایە کە لە قوڵایی دەروونیا هێزێکی کاریگەر بووبێت‌و هانی بدات بۆ ڕێگای چاکەو پاڵی پێوە بنێ بۆ دەست گرتن‌و پا بەند بوون بە ڕێبازی ڕاست‌و تەواو لە چەند کات‌و گوزەردا ، هەر چەندە وابزانێ پا بەند بوونی بە ڕێبازی ڕاستەوە دەبێتە هۆی زیان گەیاندنی بە بەرژەوەندیەکانی ژیانی ئەم جیهانە ، وە هەروەها ئەو پاڵنەرە دەروونی‌یە دەتوانێت کە لە خەسارو خراپەکاری بیپارێزێت ئەوەی لەم ڕوون کردنەوەیەدا دەردەکەوێت ئەوەیە کە :ـ

ئاینی ئیسلام بۆ چوونێکی تایبەتی هەیە بۆ بوونەوەرو وە پێوەرێکی تایبەتیشی هەیە بۆ چاکەو خراپەو سەرچاوەیەکیشی هەیە بۆ زانینی خوو ڕەووشت ، وە هێزێکی جێ بە جێ کەری تایبەتی‌یەو پاڵنەرێکیشی هەیە کە پاڵی پێوە بنێ بۆ کار کردن ، وە ئاینی ئیسلام لەم بەشەدا ڕێبازێکی تایبەتی هەڵدەبژرێت کە جیاوازە لە ڕێبازی هەموو یاسا ڕەوشتیەکانی جیهان ، وە بە هۆی یارمەتی ئەو پاڵنەرانەوە چەند کەرەستەیەکی ڕەوشتی ناسراو دەردەکەوێت بە پێی ئەندازەی تایبەتی ، وە لە هەموو لایەنەکانی ژیاندا جێ بە جێی دەکات

جا لە بەر ئەوە دەتوانین بڵێین ئایینی ئیسلام یاسایەکی خوو ڕەوشتی وای هەیە کە دەگونجێت ، لەگەڵ سروشتو زانیارییەکانی ئادەمیزاددا •

وە بۆ ئەو یاسا خوو ڕەوشتییە چەند تایبەت کارو سیفەتێکی هەیە ناگونجێت لێرەدا باسی بکەین • بەڵام ئێمە لێرەدا دەمانەوێ باسی سێ سیفەتی ئاشکرا بکەین کە هەوێنو پوختەی ئەو یاسا ڕەوشتییەن • بەڵکو لە ڕاستیدا ئەمانە لە پێشەکیەکانی ئیسلامن لە یاسای خوو ڕەوشتیدا •

سیفەتی یەکەم :ـ ئەم سیفەتە ڕازی کردنی پەروەردگارو گەیشتن بە ڕەزامەندی خوا دەکات بە مەبەست (هدف)ی سەرەکی لە ژینی ئادەمیزادا • جا بە هۆی ئەوەوە پێوەرێکی بەرز بۆ خوو ڕەوشت دروست دەبێت کە لە ڕووی بەرز بونەوەی خوورەوشتیدا هیچ شتێك ناتوانێ ڕێگەی بەرز بوونەوەو پێشکەوتنی لێ بگرێ ، وە هەروەها ئەوسیفەتە سەرچاوەیەك بۆ زانیاریو زانست بڕیار دەداو بەهرەی خۆگرتنو بە هێزی بە سەر خوو ڕەوشتی ئادەمیزاددا دەڕێژێ بە شێوەیەك کە بەرز بوونەوەو پێشکەوتنی لەگەڵ دادەبێ ، لە دوا جاردا گۆڕانو هەڵ گەڕانەوەی تێدا ڕوو نەدات ، وە هەروەها ئەو سیفەتە بە هۆی لە خوا ترسانەوە هێزێکی جێ بە جێ کەر بۆ خوڕەوشت ئامادە دەکاتو ئینسان هان دەدات بۆ هەستانو ئاگادار بوون بە پێویستیەکانی خۆی ، بە بێ ئەوەی کە دەستێکی هۆ لە هۆیەکانی دەرەوەی تێدا بێت ، دیسان ئەو سیفەتە هێزێك دەخاتە دڵی ئینسانەوە لە سایەی بڕوا بوون بە خواو بە ڕۆژی دوایی هێزێکی هاندەری لە ناو دڵو دەروونیدا دروست دەکات کە ئارەزووی هەبێت بۆ ئیش کردن بە یاسای خوو ڕەووشت لە خوودی خۆیدا •

سیفەتی دووەم : ئەو هـاندانو ئارەزوو پێ دانە ڕووتـەو هیچ ئاواتو خوو ڕەووشتێکی تازەی نە ناسراو نایەنێتە کایەوە وە هــەوڵ نادات بۆ لە ناو بردنی هــەندێ خـوو ڕەووشتی مرۆڤایەتیو بەرز کردنەوەی هەندێکی دیکە ، وە ئەو هاندانو ئارەزوو پێدانە لـە خوو ڕەووشتدا هیچ شتێك لە ناو خۆیدا ناگرێ تەنها ئەوە نەبێت کە لە ناو هەموو خەڵـکیدا ناسراوە • وە هیچ شتێك نەبچووك نەگەورە لە خوو ڕەووشتدا بە جێ ناهێڵێو پشت گوێ ناخات ، بەڵـکو دەست نیشـانی دەکاتو هەمووی وەردەگرێ • لە دواییدا هەموو یەکێك لـــە ژیانی مرۆڤایەتی لە شوێنی خۆی دادەنێت ، لـــە ڕێبازی ژیانی مرۆڤایەتیدا جێگری دەکات ، دەرگای جێ بە جێ کردنی ژیانی مرۆڤایەتی فراوان دەکات بە فراوان کردنێکی زۆر بەر بڵاو لە لایەنەکانی ژیان وە هیچ بەشێك لە بەشەکانی ژیان وەکو : کردەوەکانی تاكو کـــارو باری ناو ماڵو تێکەڵاوی شارستانیەتیو کـارو باری ڕامیاریو ئابووریو بازاڕو قوتابخانەو دادگاو ســەر بازگەو گۆڕەپانی جەنگو کۆنگرەی ئاشتیو چەندەها لایەنی دیــکە کــە پەیوەندی بە ژیانی ئادەمیزادەوە هــەیە دەبینین شوێنەواری خوو ڕەووشتی تێـــدا بەدی دەکرێو چـووەتە ناوەرۆکەوە • کەواتە ئاینی ئیسلام وا لە خوو ڕەووشت دەکات کـــە زاڵ بێت بە ســەر هەموو لایەنەکانی ژیانداو دەستی بەسەر ڕابـگات • وە بەو هۆیەوە دەیەوێ کــە جڵەوی کاروباری ژیان لە دەست هــەواو ئارەزوو هەستو بەرژوەندی دەربێنێتو بـــداتە دەست خـــاوەن خووڕەووشتی پاكو دابو نەریتی جوان • سیفەتی سێیەم : ئەو سیفەتە داوا لــە خەڵك دەکات پاسایەك بۆ ژیان بهێننە کایەوە کە بنچینەکانی لە سەر چاکە دامەزرابێت ، وە هیچ شتێکی خراپی لەگەڵ تێکەڵاو نـەبوو بێ ، وە بە شێوەیەکی وا بانـگەوازیان لێ دەکات کە خێرو چاکـــە

بکەن ، بەو شێوەیە کە مرۆڤایەتی لە کاتو شوێنێکدا بە چاوی بەرزو ڕێزەوە بۆی دەڕوانن ، وە هەروەها داوایان لێ دەکات کە هەستن بە لە ناو بردنو دوور خستنەوەی ئەو خراپانەی مرۆڤایەتی لە هەموو کاتێکدا بە چاوی سووکو چروك سەیریان دەکات •

ئا ئەم بانگەوازی‌یەیە کە ئاینی ئیسلام هەموو بەرەی ئادەمیزادی بۆ لا بانگ دەکات ئەو کەسانەی کە وەلامیان داوەتەوەو بە دەم بانگەوازی‌یەکەیەوە هاتونو لە سەر یەك ووشە کۆی کردونەتەوەو گەلێکی موسڵمانی لێ پێك هێناون ، وە مەبەستیش لە کردنیان بە یەك گەل بۆ یەکخستنی ئەوەی کە لە توانایاندا هەیە لە هەوڵو تێکۆشانی کۆمەلایەتی بۆ بەرپا کردنی چاکەو یارمەتی دانو خۆشەویستی ، وە بەرپەرچ دانەوەو گرتنی خراپەکاری •

وە گەڕانو ڕۆیشتن بە شوێنی ئەو کەسانەدا کە بەرهەڵستی چاکە دەکەنو لە پێناو کوژاندنەوەیدا هەوڵ دەدەن ، ( لادانیش نی‌یە لە خراپەو توانا نیە بۆ چاکە مەگەر بە خوا نەبێ ) •

# یاسای ڕامیاری

یەکتا پەرستیو پێغەمبەرایەتیو جێنشینی (الخلافة) ئەمانە سێ پایەن کـە یاسای ڕامیاری ئیسلامیان لە سەر بنیات نراوە ، وە شتێـکی ئاسان نی‌یە بۆ ئێمە کـە باسی هـەموو یاسـا ڕامیاریەکانی ئیسلام بکەین بە هەموو لقو چڵەکانی‌یەوە تەنهـا کاتێك نەبێت کە شارەزایی‌یەکی تەواومان هەبێت دەربارەی ئەم سێ بنەمایە (یەکتـا پەرستی ، پەیام ، جێنشینی) ، وە لە پێش هەموو شتێكدا باشتر وایە کە یەك لـە دوای یەك بە کورتی باسی هەر یەکێکیان بکەین •

(١) یەکتا پەرستی (التوحید) :

یەکتـا پەرستی مانای وایە کە تەنها خوای گەورە پەروەردگـارە بۆ ئەم جیهانەو ئەوەی کـە تێدایە لـە بەرەی ئادەمیزاد ، وە هـەر بە تەنها ئەو بەخێوکەرو پادشایە ، وە داد پرسیو دەسەڵاتو فەرمـان کردنو قەدەغە کردن تەنها بۆ ئەوە ، وە هەر ئەو شایستەی مـل بۆ کـەچ کردنو بەندایەتی بۆ کردنە •

وە بێجگە لەو هیچ کەسێك هاوبەشی لەگەڵدا ناکات ، لە دوایدا گیـانی ئێمـەو ژیانمانو هێزو تواناو هەموو ئەو ئەندامانەی کـە خوا پێی بەخشیوینو بەکاریان دەهێنین لەو کارو بارانەدا کە ئارەزووومـان

لێ‌ی هەیە ، وە هەروەها ئەو کارو فەرمانانەی کە لەم بوونەوەرەدا بۆ مان دیاری کراون ، وە ئەو بوونەوەرەی کـە ژیانی تێدا دەبەینە سەر ، ئێمـە هیچ شتێکمان لـــە مانە دروست نەکردووەو نەمان هێناوەتە بوونەوە ، وەیان بە هۆی زانیاری‌یەکەوە هێنابمانە کایەوە کە لە خوودی خۆمان دابێت ، بەڵـکو هەر خوای پەروەردگارە کە ئەم شتانەی پــێ بەخشیوین بە بێ ئەوەی هیچ کەسێك لەگەڵی‌دا هاوبەش بێت .

وە بۆ ئێمە ڕەوا نی‌یە نەزۆر نەکەم کە مەبەستی ڕێ نیشاندانمان وەیان سنوورو پلەو پایەك بەگوێرەی ویستی خۆمـان بۆ هێزو تواناو مافەکانمان دیاری بکەین ، وە هەروەهـا دروست نی‌یە بۆ هیچ کەسێك هــەر چۆنێك بێت ئەو ڕێـگایە بگرێتو خۆی تێ هەڵبقورتێنێ ، بەڵکو ئەمانە هەموویان تایبــەتن بە خوای پەروەردگارەوە ، وە هــەر ئەو بە تەنها ئەو مافانەی بە سرووشت پێ بەخشیوینو خستونیـــەتە ناو دڵو دەرونمانەوەو ڕێـگەی داوین بۆ سەر پەرشتی کردنی زۆر لە دروست کراوەکانی خۆی لەم جیهانەدا ، ئا ئەوەیە بیرو باوەڕی یەکتا پەرستی ، هەر وەکو دەبینیت لە توانای‌دا هەیە کە بیرو باوەڕی خــوکم کردنی ئادەمیزاد وەلا بنێ بە یەکجاری بە سەریدا زاڵ بێت وە هیچ کـەسێك مافی حوکمی نی‌یە تەنها خوا نەبێت وە هیچ داد برسێکیش نی‌یە تەنهـا خوا نەبێت وە هیچ دادو یاسایەکیش نی‌یە تەنها دادو یاســـای ئـەو نەبێت .

## پەیام (الرسالة) :

پەیام بریتی‌یە لـەو هۆیەی کــە یاسای خوایی بە هۆی ئــەوەوە دەگاتە ئێمە ، ئەوەی کە بە هۆی پەیامەوە پێمان دەگات شی کردنەوەیە بۆ

قورئان‌و ڕاڤه کردنی ، پاڵ پشتێکه که پێغه‌مبه‌ر ( صلی الله علیه وسلم )به بەقـەو کردار پێشکه‌شی کردووین به پێی ئه‌وه‌ی که جێ نشێن‌و خه‌لیفه‌ی خوایه له‌م جیهانه‌دا ، وه خوای گه‌وره له قورئانی پیرۆزدا هه‌موو ئـــه‌و شتانه‌ی له بنج‌و بناواندا ڕوون کردۆته‌وه کـــه پێویسته یاسـای ژیانی مرۆڤایه‌تی له سه‌ردا بنرێ به‌ڵام ئه‌وه‌ی له مـه‌و دواوه پێویستمان پێی ده‌بێ به ڕوون کردنه‌وه‌و شی کردنه‌وه بۆ بنج‌و بنـاوان ئه‌وا پێغه‌مبه‌ری مه‌زنمان ( صلی الله علیه وسلم ) ڕوونی کردۆته‌وه‌و له ژیانیدا نواندوونی به دامه‌زراندنی یاسای ژیانی مرۆڤایه‌تی‌و هه‌ڵسوڕاندنی بـــه گوێره‌ی ویستی قورئان ، بۆ ئه‌وه‌ی ببێته پێشڕه‌وێـکی ڕێك‌و پێك‌و جـــوان بۆ شوێن که‌وتوانی ، ئه‌و دوو بنج‌و بنـــاوانه لـــه زاراوه‌ی ئیسلامدا پێی ده‌ووترێ (شه‌ریعه‌ت) که بریتی‌یه له‌و ده‌ستوره بنچینه‌یی‌یه‌ی کــــه کۆشکی ده‌وڵه‌تی ئیسلامی له سه‌ر داده‌مه‌زرێنێت •

٣ ــ جێ‌نشینیه‌تی (الخلافة) :ــ

جێ‌نشینیه‌تی لـــه زمانی عه‌ره‌بیـــدا به سه‌ر جێگری ( نیابة )دا ده‌بڕدرێت ، وه پله‌و پایه‌ی مرۆڤ له‌و بوونه‌وه‌ره‌دا له ڕوانـــگه‌ی ئاینی ئیسلامه‌وه جێ‌نشینیه‌تی‌یه بۆ خوا ، مانای وایه کـه ئاده‌میزاد جێگری ئه‌وه له هه‌موو کاروباری ژیانیدا وه نابێ هیچ شتێك له کارو باری ژیانی ببـات به ڕێوه مه‌گه‌ر به پێی ئه‌و مافه جێ نشینیه‌تی‌یه نه‌بێ که خوای گـــه‌وره پێی به‌خشیوه •

ئایا نه‌ت بینیوه کاتێك که کارو باره‌کانت ده‌خه‌یته ژێر چـــاودێری یه‌کێك‌و ده‌یکه‌یته جێگری خۆت ، له چوار شتدا بڕوای به تۆ هه‌یه :

یه‌که‌م : ته‌نها تۆ خاوه‌نی ڕاسته‌قینه‌ی کاروباره‌کانتی نه‌ك ئه‌و که‌سه‌ی که کارو باره‌کانت خستۆته ژێر ده‌ستی •

دووەم : پێویستە لە سەر ئەو کەسەی کە ئیش‌و کارەکانت خستۆتە بەر دەستی بە پێی فەرمان‌و ڕێنمایی تۆ بڕوات بە ڕێوە •

سێیەم : بۆی نی‌یە کە سەر پێچی فەرمانەکانت بکات‌و لەو سنورە تێ پەڕێ کە بۆت دیاری کردووە بۆ ئیش کردن •

چوارەم : پێویستە لە سەر ئەو جێگرە کە بە پێی ویستی تۆ کارەکان بکات نەك بە ئارەزووی خۆی •

ئەو چوار خاڵانەی کە باسمان کردن بە شێوەیەکی تەواو بریتین لە جێ نشینیەتی بە شێوەیەك تەنها بە دان نان بەوشەی (النیابة) دادەمەزرێت • ئەگەر هات‌و جێگرێکت دیت بە پێی ئەو چوار مەرجانە کاری نەکردو بە گوێرەی پێویست ئەرکی سەرشانی نەبرد بەڕێوە ، ئەوە لەو کاتەدا بەو کەسە دەوترێت لە سنوور لای داوەو پەیمانی جێگریەتی هەڵوەشاندۆتەوە ، ئەو دەوڵەتەی کە بە پێی ئەو تیۆرە ڕامیاریە دەڕوات بە ڕێوە تەنیا جێ‌نشینی مرۆڤایەتی‌یە لە ژێر دەسەڵاتی پەروەردگاری باڵا دەست دایە وە مەبەستی سەرەکیش هێنانەدی ویست‌و ڕەزامەندی خوای گەورە بێت ، وە بە پێی ڕێنمایی ئەو بڕوات بە ڕێوە بە بی ئەوەی تێ بپەڕێت ئەو سنورەی کە بۆی دیاری کراوە بۆ بەڕێوە بردنی ژیانی خۆیی‌و کارو بارەکانی •

وە ئەوەی لێرەدا دەگووجێ باس بکرێ ئەوەیە کە ئاینی ئیسلام سیفەت‌و مەدالیای جێ (نشینیەتی) نالکێنێ بە هیچ کەسێکەوە لە ئەندامانی کۆمەڵ ، وە نەبە هیچماڵێك وە نە بە هیچ چینێك ، بەڵکو فەرمانی جێ‌نشینیەتی دەداتە دەست هەموو تاکەکانی ئەو کۆمەڵەی کە بڕوای ڕاستەقینەی بە بنچینە سەرەکیەکانی یەکتا پەرستی‌و پەیام هێنایێت ، وە لێهاتووی تێدا بەدی بکرێت‌و ئامادەیی هەبێت بە هەستان بە هەموو ئەو

ئیش‌و کارانەی کە جێ نشینەتی دەیگرێتە ژێر خۆیەوە ، ئەگــەر هــات‌و لە جیهاندا کۆمەڵـگایەك بەو ناونیشانانە هەبوو ئەوە هیچ گومانی تێــدا نی‌یە کە ئەو کۆمەڵـگایە شایەنی ئەوەیە کــە ببێت بە جێ‌نشین ، وە ئــا ئەم شوێنەیە کە بیرو باوەڕی کۆمەڵـگای ئیسلامی لێ پەروەردە دەبێت‌و سەر هەڵ دەدات ، وە هەموو یەکێك لە ئەندامەکانی کۆمەڵـگای ئیسلامی بەشێکی بە جێ نشین‌ی‌و وەرگرتنی‌دا هەیە •

وە ئەو مافە هەموو ئەندامەکانی کۆمەڵ وەکو دەنکەکانی شانە تێدا یەکسانن ، وە هەروەها ڕەوا نی‌یە بۆ هیچ کەسێك کە ئەم مافانە قەدەغــە بــکات لە هەر کەسێك کە لە کۆمەڵـگای ئیسلامی‌دا ئارەزووی لێ بێ : شتێکی ڕوون‌و ئاشکرایە کە هەر دەوڵەتێك بیەوێت کارو باری وولات بــە ئاسانی ببات بەڕێوە پێویستی بە ڕەزامەندی‌و لایەنگری گشتی کۆمــەڵ دەبێت ، وە هەر ئەوان لایەنێك لە مافەکــانی جێ‌نشینیان دەخــەنە ژێر دەستیەوە وە ئەو جێ‌نشینیەش ڕێك نایەت‌و دانامەزرێت تەنها بەڕای ئەوان نەبێت ، وە هیچ کارو بارێك نابرێت بە ڕێوە تەنها بە ڕاوێژی ئەوان نەبێت، کەواتە هەر کەسێك ڕەزامەندی جەماوەری بۆ لای خۆی ڕاکێشاو بوو بە جێ‌ی بڕوا پێ کراویان ئەوە لەو کاتەدا دەبێتە جێ‌نشینیان بۆ هەستان بە پێویستیەکانی جێ‌نشینی وە هەر کەسێك متمانەی خۆی لــە ناو کۆمەڵدا لە دەست دا ناچارە دەبێ واز لەم پلەو پایە مەزن‌و گرنگە بێنێ ، کــەواتە کۆمەڵـگەی ئیســلامی کۆمــەڵـگەیەکی ڕێك‌و پێك‌و تەواوەو هیــچ مەبەستێکی نیە ، بەڵام تەنیا ئەوەی کە کۆمەڵگەی ئیسلامی لە کۆمەڵـگە ڕۆژ ئاوایی‌یە ناسراوەکانی ئیمڕۆ جیا دەکاتەوە ئەوەیە کە تیۆری ڕامیاری ڕۆژ ئاوا دەڵێت :

دەبێ جەماوەر ببێتە جێ‌نشینی خــوا لــە سەر زەوی ، وە ڕوون

کردنەوەی ئەو لایەنەش ئەوەیە کە مافەکانی دادو فەرمان ، لە کۆمەڵگای ڕۆژ ئاوایی‌دا ، کۆمەڵی پێ دە چەوسێندرێتەوە وە هـــەر ئەوان جڵەوی کارو باریان بە دەستەوەیەو بە ئارەزووی خۆدان بەرنامەو ڕێبـــاز دا دەنێن ، وە ئەوەی کە ئارەزوودان لێ بێت لە دانانی دەستوورو یاسا لـــە سەر زەوی‌دا بە گوێرەی ویستو خواستی خۆیان جێ بە جێی دەکەن • وەمەبەستی سەرەکیش لە حوکم گێرانیان بریتی‌یە لـــە ڕازی کـــردنی خواستی گشتی دانیشتوان ڕاکێشانی سەرنجیانو جێ بەجێ کردنی هەواو ئارەزووی خۆیان •

بەڵام ئایینی ئیسلام بە پێچەوانەی ئەوەیە حوکم گێڕان ، فەرمـــان دەرکردن ، تەنها شایستەی خوای گەورەیە ، هەر خوایە بە تەنها کـــە مافی یاساو دەستور دانانی هـــەیە بۆ بەندەکـــانی بەبێ • هاوبەش‌و بێ بەرامبەر ، بەڵام پلەو پایەی کۆمەڵ لە ڕوانـــگەی ئیسلامەوە وەکو پلەو پایەی ئەو جێ نشینانە وایە کە بە سرووشتی پلەو پایەیان ناچـــارن کـــە دوای ڕێبازی ئەو خوایە بـــکەون کە پێغەمبەر ( صلی الله علیـــە وسلم ) لە لایەن ئەوەوە هێناویەتی بە موو لێی لا نادەن ، وە ئەوانەی بە دوای ڕێبازی خوا کەوتون لە کۆمەڵـــگای ئیسلامی‌دا هیچ مەبەستێکیان نەبووە تەنها ڕەزامەندی خواو جێ بەجێ کردنی فەرمانەکانی نەبێ ، پوختـــەی قسان ئەوەیە کە کۆمەڵـــگای ڕۆژ ئاوایی پلەو پایەی خوایەتی بۆ خـــۆی داگیر دەکات بە زۆرە ملی‌و خۆ سەپاندن لە سەر زەوی خوادا بـــە بێ ئەوەی مافی هەبێ ، وە هەرچی وزەو توانا هـــەیە بە گوێرەی ویستی خۆیی‌و ئەندامەکانی دەیخاتە کار • بەڵام کۆمەڵـــگای ئیسلامی بەندایەتی‌یەکی کۆمەڵایەتی‌یە بۆ خوای گەورەو بە کەمەندی یاســـای خواوە بەستراونەتەوە ، وە ئەو هێزو توانایەی کە هەیەتی بە کـــاری

ناهێنێ تەنها لە چوار چێوەی ئەو سنورەدا نەبێ کە خوای گــەورە بۆی دیاری کردووە •

ئێستاش دەمانەوێ بە کورتی وێنەیەکی ڕوونو ئاشکراتان بخەینـــە پێش چاو دەربارەی ئەو کۆمەڵـگایەی کە بناغەکەی لە ســەر بنچینەی یەکتا پەرستیو پەیامو جێنشینی دادەمەزرێنێت ، وە مــەبەستی ئــەو کۆمەڵگایەش هەر وەکو خوای گـــەورە لە چـەند شوێن لە قورئانە پیرۆزەکەیدا باسی کردووە ئەوەیە :ــ کە ئەو خووڕەووشتە بەرزانــەی خوای گـــەورە دەیەوێ ژیانی مرۆڤایەتی پێی شیرینو ڕازاوە بێتو خێرو فەڕەکەی بە هەموو لایەکدا بە گوێرەی توانا بڵاو بێتەوەو هەوڵ بدات بۆ بەرزکردنەوەو زۆر کردنی ڕێبازە چاکەکانیو بنە بڕ کردنو نەهێشتنی هەموو ئەو خراپەو خراپەکاریانەی کە خوا پێی ناخۆشە لــە سەر زەوی بکرێت ، وە پاکی بکاتەوە لە چڵكو چەپەڵی گومـــان ، وە ئاینی ئیسلام تەنیا هــــەر بۆ ئەوە نەهاتووە کە دەوڵەتێك دابمەزرێنێو گرنــگی بە هەڵسوڕاندنی کارو بارەکانی بداتو هەڵ بستێت بە گرنــگی دان بە بەرژەوەندی گەلێــکی تایبەت لە ناو هــەموو گەلانی جیهان داو باقی گەلانی دیکەش پشت گوێ بخات •

بەڵــکو ئەوەی ڕاستی بێت ئەوەیە کە ئاینی ئیسلام لەو دەوڵەتەی کە بە پێی بنچینەکانی ئیسلام دایدەمەزرێنێت مەبەستێکی زۆر پیرۆز ترو بەرز تری هەیە ، وە لە سەری پێویست دەکات کـــە هەرچی لــە توانای‌دا هەیە بە کــاری بهێنێ لە پێناو بەدی هێنــانی کۆمەڵــگایەکی ئیسلامی‌دا بۆ وەدەرخستنی ئەوەی کــە خوای گەورە دەیەوێت ژیانی بەندەکانی لە سەر زەوی‌دا پێ بڕازێنێتەوە ، وە بە ڕەنــگی پاکیو جوانیو خێرو تەواویو ڕزگاریو خۆش بەختی ڕەنگ بداتەوەو ، هەڵبستێ بـــە

لە ناو بردنی هەموو ئەو شتانەی کە دەبنە هۆی خراپەو ئاژاوە نانەوە بۆ سەر بەرژەوەندی بەندەکانی خوای گەورە •

وە ئایینی ئیسلام وێنەیەکی ڕوونو ئاشکرامان لە چاکەو خراپە دەخاتە پێش چاو بۆ ئەوەی لەو ڕووانگەیەوە بتوانین بڕوانینە ئەو بەرژەوەندی‌یانەی کە خوای گەورە پێ‌یان ڕازی‌یەو ئەو خراپەو کاریانەی کە خوا ڕقی لێ‌یان دەبێتەوە ، کەواتە کۆمەڵگای ئیسلامی لە هەموو چەرخو زینگەیەکدا دەتوانێت بەرنامەی چاك کردنو پەروەردە کردن بسات بە ڕێوە ئەگەر هاتو ئەو وێنە ڕوونو ئاشکرایەی چاکەو خراپەی لە پێش چاو دابنرێت • وە ئەوەی کە ئایینی ئیسلام زۆر مەبەستی‌یە داوا لە نەوەکانی دەکات کە دەستی پێوە بگرنو لە بنچینە خوو ڕەووشتیەکانی لا نەدەن ، وە هەر بەم شێوەیە نەخشەیەکی پتەوی بەردەوام بۆ کۆمەڵگاکەی دەکێشێت بۆ ئەوەی لایەنی ڕامیاری‌یەکەی لە سەر بنچینەی ڕاست گۆیی‌یەکی پوختو داد گەریەکی درەخشانو دەست پاکی‌یەکی بێ گەرد دابمەزرێنی ، وە لە هیچ کاتو زەمانێکدا ئایینی ئیسلام ڕازی نابێت کە کۆمەڵگاکەی لە زۆر داری‌و فێڵو دەست درێژی نزیك بکەوێتەوە لە پێناوی بەدی هێنانی بەرژەوەندی‌یەکانی نیشتمانی‌و بەڕێوە بردنو نەتەوەیی وە ئایینی ئیسلام لە هەموو کاتێك ڕەوایی‌و دەست پاکی‌و داد گەری بە زیاتر دادەنێ لە سەر هەواو ئارەزوو پەیوەندی خزمایەتی‌و نزیکی لە نێوان پێشەواو گەلدا لە ناوەوەی وولات وە لە نێوان گەلێكو گەلێکی دیکە لە دەرەوەی وولاتدا •

دیسانەوە ئایینی ئیسلام فەرمان دەکات بە دەوڵەتی ئیسلامی‌و ئەوانەی هەڵ دەستن بەبەڕێوە بردنی کارو بارو ئاکەکانی تر هەرکاتێ

بە لێنتان دا بەلێنەکە بە تەواوی بەنە سەر ، وە کێشانەو پێوانە بە تەواوی ئەنجام بدەن وە مافی خەڵکی بە ناڕەوا نەخۆن وە ئەوەی کـە بەزار دەیلێن کردەوەی پێ بکەن ، وە ئەو مافانە لە بیر مەکەن کە لە لایەن خەڵکی یەوە بە سەرتانەوە هەروەك چۆن کـە مافی خۆتان بە سـەر خەڵکی یەوە لە بیر ناکەن ، وە دەسەلات و هێزی ماددی‌تان مەکەنە هۆی زولم و زۆرداری ، ئەوەش بزانن کە ڕاستی لە هەموو کاتێك‌دا هـەر ڕاستە ، جا کەوایە پەلە بکەن بۆ جێ بەجێ کردنی ، وە هێـزو دەسەلاتیش سپاردەیەکی خوایی‌یە بۆ بەندەکانی هەر کاتێك بە کـارتان هێنا دلنیا بن لەوەی کە لێپرسراون لە بەردەم بارەگای خوا بە بێ کـەم و کووڕی • ئینجا دەولەتی ئیسلامی هەر چەندە لە ناوچەیەکی تایبەت لـە ناوچەکـانی زەوی ، یان لە پارچەیەك لـە پارچـەکانی دا بەرپا ببێت مافەکانی مرۆڤایەتی و شارستانیەت بۆ سنووری جوغرافی دیاری ناکات ، بۆ وێنە : ئاینی ئیسلام بۆ مرۆڤایەتی چـەند مافێـکی ڕامیـاری دیاری دەکات و فەرمان بە چاودێری کردن و پاراستنی دەکات لە هەموو کاتێك دا بۆ هەموو ئادەمیزاد لە سـەر زەوی ، جا ئەو ئینسانە چ لـە ناوەوەی دەولەتی ئیسلامی دا بێت یا لە دەرەوەی ، دوژمن بێت یا دۆست بێت ، خۆشەویست بێت یا ناخەز بێت ، بە هۆی جەنگەوە ، وە ئەوەی لێـرەدا ئاینی ئیسلام بە گرنـگی دەزانێت ڕێز گرتنی ئادەمیـزادو بە فیـڕۆ نەچونیەتی ، چونکە خوین ڕشتن لە هەموو کاتێکدا حەرامەو درووست نیە تەنها بە مافێکی ڕەوا نەبێ ، وە لە ئاینی ئیسلامـدا ڕەوا نی‌یە دەست درێژی کردن بۆ سـەر ئافرەت و منداڵ و پەك کەوتەو نەخۆش و بریندار لە هـەر کاتێکدا بێت ، وە هەروەها بە پێویستی داناوە کـە ڕێز لـە شەرەف و ناموسی ئافرەت بگرێ ، وە بە هیچ کلۆجێك دروست نیـە سوکایەتی و دەست درێژی بۆ سەر بکرێ ، وە پێویستە خواردن بدرێتە

برسیو پۆشاك بدرێته ڕووتو ، بریندار دەرمان بکرێو نەخۆش دڵی بدرێتەوە ، هەر چەندە کە ئەو ڕووتو بریندارو نەخۆشانە لە گەلێکی دوژمن بە دەوڵەتی ئیسلامی بن ، ئا ئەم مافانەو چەندەها مافی دیکەش لە وانەی کە ئایینی ئیسلام بەخشیونی بە ئادەمیزاد لە بەر ئەوەی ئینسانەو پلەو پایەو مافی بنچینەیی هەیە لە دەستوری دەوڵەتی ئیسلامیدا •

بەڵام مافە شارستانیەتەکان ئایینی ئیسلام تایبەتی نەکردووە تەنها بەو کەسانەی کە لە ناوەوەی دەوڵەتی ئیسلامی لە دایك بوون بەس ، بەڵکو لە ڕاستیدا هەموو موسڵمانێك لە هەر شوێنێك لە دایك بوو بێو پەروەردە بووبێ ئایینی ئیسلام سەر پشکی دەکات بۆ وەرگرتنو گەیشتن بە مافە شارستانیەکان ، تەنها بە هاتنە ناو سنووری دەوڵەتی ئیسلامی ، وە بەشو مافی ئەو کەم تر نیە لە بەشو مافی ئەوانەی کە لە ناو دەوڵەتی ئیسلامیدا پشتاو پشت لە دایك بوونو هەر چەندە ژمارەی دەوڵەتە ئیسلامی یەکان لە سەر زەویدا بگاتە ژمارەیەکی زۆر ، پێویستە لە سەر دانیشتوانی ئەو دەوڵەتانە کە لە هەموو مافە شارستانیەکاندا هاوبەش بن ، وە مرۆڤی موسڵمان هیچ کاتێك پێویستی بە پەساپۆرت نیە بۆ هیچ وولاتێك لە وڵاتانی سەر زەوی کە بیەوێ سەفەر بکات بۆیانو بچێتە ناویانەوە ، وە بە گوێرەی تواناو لێهاتووی خۆی ئەوەندەی ئارەزووی لێ بێت دەتوانێت بەرز بێتەوە بۆ پلەو پایەو لێپرسراویو کار بەدەستی بە بێ ئەوەی هیچ شتێك لە ڕەچەڵەكو هۆزو چینایەتی بتوانێت ڕێی لێ بگرێتو بێتە بەر بەست لە بەردەمیدا • وە ئەو کەسانەی لە ناو خاکی دەوڵەتی ئیسلامیدا دەژین ( بێجگە لە مسوڵمانان ) ئایینی ئیسلام چەند جۆر مافی بۆ دیاری کردوون کە ئەمەش بە سرووشت بەشێکە لە بەشەکانی دەستوری ئیسلامو لێی جیا نابێتەوە وە لە زاراوەی ئیسلامیدا بەم جۆرە کەسانە دەووترێ ( اهل الذمة ) کە بریتییە لەو کەسانەی

ئاینی ئیسلام مافی پاراستنی گیانیانی مسۆگەر کردووە ، وە هیچ گومانی تێدا نی یە کـە گیانو ماڵی ( اهلی ذمه ) پارێزراوەو دەست درێژی کردن بۆ سەریان قەدەغەیە ، هەر وەکو چۆن کـــە گیـانو ماڵی مسوڵمانان پارێزراوە ، وە هیچ جیاوازیەك لە نێوان مسوڵمانو ( اهل ذمـة )دا نی یە لەو یاسایانەی کە دانراون بۆ تاوانبارانو بەڕێوە بردنی کـــارو باری شارستانیەت ، وە ڕەوا نی یە بۆ دەوڵەتی ئیسلامی کە دەست لـــە یاسـا کەسایەتیەکانی ( اهل ذمة ) بدات ، وە لـــە بیرو باوەو بیر کردنەوەو بەندایەتیو درووشمە ئاینیەکانیان دا سەر بەستن : ئەوانەی کە باسمان کردن نموونەی مشتێکن لە خەرواریك لەو مافانەی کە ئاینی ئیســـلام بەخشیونی بە هاولاتیانی غەیرە مسوڵمان ، ئەمانە لەو مافە سەر بەخۆیی یە دامەزراوانەن کە ڕیشەکەنی کردنو دەست بە سەردا گرتنیان درووست نیە ، مادام لە ژێر سنوورو پاراستنی ئێمە دان ، هەر چەندە دەوڵەتێـکی نا مسوڵمان هاولاتی یە مسوڵمانەکان بچەوسێنێتەوەو بـە چـــەندەها شێوە ئەشکەنجەو ئازاریان بدات لە بەرامبەر ئەوەدا ڕەوا نی یە بۆ دەوڵـــەتی ئیسلامی کـە دەست درێژی بـکاتە سەر هاولاتیە نامسوڵمانەکانو لـە مافەکانیـــان بێ بەشیان بـکات : بە پێچـــەوانەی شەریعەتی ئیســلامو هەڵوەشاندنەوەی بڕوا نامەو پەیمان ، ( وە سوێند بێ بە ڕاستی ) ئەگـەر هەموو مسوڵمانان لە دەرەوەی دەوڵەتی ئیسلامیدا بکوژرێن بۆ ئێمـە ڕەوا نیـە کە لە ناو سنوری دەوڵەتی ئیسلامیماندا خوێنی تاقە کەسێکی ئەهلی ذمە ( اهل ذمة ) برێژین مەگەر تاوانێکی وای کردبێ کـــە شـایانی کوشتن بێ . وە بەڕێوە بردنی دەوڵەتی ئیسلامیو ئاسان کردنی ئیشو کارەکانی دەدرێتە دەست کەسێکەوە کـە لە پلەو پایەو لێهاتوویی‌دا بتوانێ کـارو باری ولات بە پێی کاتو سەر دەمو ولاتانی تر بەڕێوە ببـــات ، وە هەر کەسێك باوەڕی بە بنچینەکانی یاسای ئیسلام هەبێت مافی ئـەوەی

هەیە کە ڕای خۆی بۆ هەڵبژاردنی جێ نشینی دەر ببڕێت ، وە ئــەوەی کە بە شێوەیەکی تایبەت لــە هەڵبژاردنی جێنشینیدا تێ بینی دەکرێت ئەوەیە : کە خوا پەرستیو لە خوا ترسانو شارەزایییەکی تــەواوی دەربارەی ئیسلام هەبێت ، وە لە هەمان کاتدا لێهاتوویییەکی تــەواوی هەبێت لە هەڵسوڕاندنی کــارو باری میللەتی ئیسلام ، لە کاتی جەنگو ئاشتیدا ، وە پلەو پایەو جێنشینیەتی نادرێت تەنها بەو کەسە نەبێت کــە ئەو خوو ڕەووشتو ئاکارانەی تێــدا کۆ بێتەوە وە لە هەموو کەس زیاتر جێگەی متمانەو باوەڕ پێ کراوی گەل بێت ، لــە دوایدا کۆڕی ڕاوێژ کردن لە لایەن هەموو جەماوەرەوە هەڵدەبژێر درێت ، بۆ یارمــەتی دانی جێنشینی (الخلیفة) • وە لە سەر جێنشین ( خلیفة ) پێویــستە کە هەموو کارو بارەکانی دەوڵەت بە پێی ڕاوێژی ( اهــل الحل والعقد ) کۆڕی ڕاوێژ کردن ببات بە ڕێوە • وە ئەو کەسە هەر بە جێنشینی دەمێنێتــەوە مادام جێگەی متمانەی گەل بێت ، بەڵام ئەگەر هاتو ئــەو بڕواو متمانەیەی لە دەستدا نەمــا ئەوە پێویستە لەو پلەو پایەی بێتە خوارەوە ، بەڵام لەگــەڵ ئەوەشدا بەردەوام گوێ بۆ قسەو فەرمانی دەگیرێ مــادام جێگای بڕواو متمانەی خەڵك بێ ، بەڵکو لەو کاتەدا بۆی هەیە کە خۆی هەڵبژێرێتو بەر پەرچی ڕای هەموو ئەندامانی کۆڕی ڕاوێژ بداتــەوە ، کاتێك بۆی دەرکــەوت ئەوەی کــە ئەوان بۆی چوون پێچــەوانەی ڕاستەقینەیە •

وەهەموو هاوڵاتیان مافی ڕەخنە گرتنیان هەیە کاتێك کە لە دەوڵەتی خەلیفەدا شتێکیان بینی شایەنی ڕەخنــە لێ گرتن بێت ، بەڵام دەستورو یاسا دانان لە دەوڵەتی ئیسلامیدا ڕێــگەی پێ نادرێ تەنها لە چوار چێوەی ئەو سنورانەدا نەبێت کە شەریعەتی ئیسلام بۆی دیاری کردووە ، وە نابێ لێی لا بدرێت •

وە ئەو بەرنامەیەی کە خوا ناردویەتیە خوارەوەو پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) ڕای گەیاندووە پێویستە لە سەر گەلی مسولمان بە تەواوی ملی بۆ کەچ بکەن ، وە بۆ هیچ کۆڕێك لە کوڕەکانی یاسا دانان ڕەوانیە کە بچوکترین گۆڕانکاری تێدا بکەن ، بەڵام دەربارەی ئەو حوکمانەی کە زیاتر لە مەبەستێك دەگەیەنن پێویستە لە سەر ئەو کەسانەی کە لە ئایین شارەزان لایەنو مەبەستی ڕاستی شەریعەتی تێدا ڕوون بکەنەوە ، ئەوانەو چەندەها شتی تر کە لە سەر ئەم شێوەیەن دەخرێنە بەردەم لیژنەیەك لە زانایانو شارەزایانی کۆڕی ڕاوێژ • وە ئەگەر هاتو کۆمەڵێك لە کارو بارو ڕووداوی گەورەی وایان بەر چاو کەوت کە هیچ دەقێکی تایبەتیان دەربارەی نەهاتۆتە خوارەوە • ، لەو کاتەدا پێویستە لە سەر کۆڕی ڕاوێژ یاسایەك بۆ ئەو کارو بارانە لە چوار چێوەی سنوری شەریعەتی ئیسلامدا دیاری بکات • وە داد پرسین لە ئیسلامدا نە لە خەلیفەو نە بەڕێوەبەرانی دەوڵەت هیچ کامیان دەسەڵاتیان تێیدا نی یە ، وە ئەو کەسەی دەبێتە داد پرس مانای وایە ئەوە دەبێتە جێنشینی خواو لێ پرسراوە لە بەر دەمیدا • وە داد پرس (قاض) لەگەڵ ئەوەوا کە دەوڵەت دای دەنێ سەرپەرشتی دەکات لە کۆڕو داد پرسیدا بۆی نیە حوکم لە نێوان خەڵکدا بکات تەنها بە پێی ئەو بەرنامەیە نەبێت کە خوا ناردویەتە خوارەوەو پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) ڕوونی کردۆتەوە • وە ئەو دادپرسی یە نابێت داد پرسەکە لە هەقو داد گەڕی بگێڕێتەوە هەر چەندە داد پرسی یەکەی لەگەڵ پیاوانی دەوڵەتیشدا بێت ، بەڵکو پێویستە لە سەر سەرۆکی دەوڵەت کە لە بەردەم داد پرسدا ئامادە بێت وەکو هاوڵاتیانی دیکە ئەگەر هاتو داواکار یان داوا لە سەر کراو بوو •

# یاسای کۆمەڵایەتی

ئەو تیۆرەی کە یاسای کۆمەڵایەتی ئیسلامی لە سەر بنیات دەنرێ ئەوەیە : کە تاکەکانی بەرەی ئادەمیزار هەموویان لە سەر زەوی‌دا لە یەك ڕەچەڵەکن خوای بێ هاوتا لە سەرەتادا بێجگە لە گیانێك هیچی دیکەی دروست نەکرد ، وە هەر لەم گیانەش هاوسەرەکەی دروست کرد ئەوانەی کە ئێستا دەیان بینین زەوی خوایان لە هەموو کونو قوژبنێك‌دا ئاوەدان کردۆتەوە وە لە سەرەتادا بەرەی ئەم نێرو مێیە ( آدمو حواء ) یەك گەلو یەك ئایینو یەك زمان بوونو هیچ جیاوازیو دوورە پەرێزی لە نێوانیان دا نەبووە ، بەڵام هەر کە ژمارەیان زیادی کردو بەرەو زۆر بوون چوونو بڵاو بوونەوەیان لە هەموو ناوچەکانی زەوی‌دا پەرەی سەند ، وە هەر بە هۆی ئەو پرژو بڵاویەوە دابڕ دابڕو بەش بەش بوون بۆ چەندەها گەلو نەتەوەو هۆز ، وە ئەم جیاوازیانە خۆی کێشایەوە ناو جلو بەرگو شێوازی ژیانیانو ، ئاوو هەوای جیاجیای ناوچەکانی سەر زەویو کارێکی گەورەی کردە سەر ڕەنگو ڕوخسارو ئاکاریان .

وە ئەم هەموو جیاوازیانە لە جیهانی ئەمڕۆ بەر چاوو لە واقیعی کارو بارو ڕاستەقینەدا بەدی دەکرێت ، وە ئایینی ئیسلام دان بەم ڕاستی‌یەدا دەنێت وە بڕیاری لە سەر دەداتو نایەوێت لە ناویان ببات ، بەڵکو لە سەروی ئەمەشەوە ئایینی ئیسلام دەڵێت ئەم جیاوازیانە سوودمان پێ دەبەخشن لە کارو باری کۆمەڵایەتیماندا ، چونکە

ئاشنایەتی‌و کۆمەکی کردن لە نێوانماندا دروست نابێت تەنها بە هۆی ئەم جیاوازیانە نەبێت بەڵام لەگەڵ ئەمەش‌دا ئایینی ئیسلام هەموو ئەو جیاوازیانە وەلا دەنێت کە لە نێوان خەڵکی پەیدا بوون‌و لە دەمارگیری‌و ڕەچەڵەك‌و ڕەنگ‌و زمان‌و بیرو باوڕی نەتەوایەتی‌و نیشتمان پەرستی ، بە هەڵەو سەر لێ‌شێواوی دەداتە قەڵەم • وە هەر جیاوازی‌یەك کە پەیدا دەبێت لە نێوان دوو کەس‌دا لە سەر بنچینەی دەوڵەمەندی‌و هەژاری‌و پلەو پایەو کەم دەستی‌و ، نزیکی‌و دووری لە وانەبن کە ببنە هۆی جیاوازی ڕەچەڵەك‌و خێزان‌و ژینگەو دەورو بەر ، ئایینی ئیسلام بەشتێکی پڕو پوچ‌و خەرافی‌و سەر لێ شێواوی دادەنێت وە پەیامی ئایینی ئیسلام بۆ هەر کەسێك کە لە سەر ئەم زەوی‌یەدا بژیەت ئەوەیە : کە خوا ئێوەی لە نێرو مێ‌یەك دروست کردووە وە ئێوە هەمووتان برای یەکترین‌و لە مافەکانی مرۆڤایەتی‌دا یەکسانن‌و لەم ڕووەوە هیچ کەسێك گەورەیی بە سەر ئەوەی دیکەوە نیە •

ئا ئەمەیە بۆچوونی ئایینی ئیسلام بۆ مرۆڤایەتی ، وە لێرەدا دەردەکەوێت کە ناگونجێت جیاوازیەکی ئاشکرا لە نێوان مرۆڤێك‌و مرۆڤێکی دیکەوا هەبێت لە سەر بنچینەی جیاوازیان لە ڕەچەڵەك‌و ڕەنگ‌و نیشتمان‌و زمان‌دا ، بەڵکو ئەو جیاوازیە ئاشکرایانە لە نێوان هەموو تاکەکانی ئادەمیزاددا دەردەکەوێ بە هۆی جیاوازی بۆ چوون‌و مەبەستیان لە ژیان‌دا ، بۆ نموونە : دوو برا هەر چەندە لە ڕووی ڕەچەڵەکەوە لە دایك‌و باوکێکن بەڵام لە ڕەوڕەوەی ژیانیان‌دا لە سەر دوو ڕێبازی جیاواز دەڕۆن ، هەر کاتێك لە بیرو باوەڕو خوو ڕەووشتی‌دا جیاواز بن ، وە تاکەکانی ئادەمیزاد لە سەر بنچینەی نەتەوەو ڕەچەڵەك یەکتری نەگرن ، بەڵکو یەکتر گرتنیان لە سەر بنچینەی بیرو باوەڕێکی دیاری کراوو ، خوو ڕەوشتێکی بەرز بێت ، وە هەر کەسێك

بڕوای بە خوایەتی خواو پاشایەتی ئەو هەبێت ڕازی دەبێت بە وەی کە پێغەمبەران ( علیهم السلام ) پێی هەستاون و ئایینی ڕاستەقینە کە ببێت بە بەرنامەی کردەوەی بۆ ژیانی ، وە دەبێت بە بەشێك لە بەشەکانی ئەو کۆمەڵگایەو بە تاکێك لە تاکەکانی ، جا چ لە وەڵاتی ئەفریقادا بێت یان لە ئەوروپا بێت وە یان لە ڕەچەڵەکدا بچێتەوە سەر ڕەگەزی سامی وە یان بچێتەوە سەر ڕەگەزی ئاری ، ڕەش پێست بێت یان سپی بێت ، بە زمانی کوردی بدوێت یان بە زمانی عەرەبی ، هەموو ئەوانەی کە لەو کۆمەڵگایەدا بەشداریان کردووە لە پلەی کۆمەڵایەتی و مافەکانیاندا وەکو دەنکی شانە یەکسانن وە هیچ شتێك لەو جیاوازییە ( الفوارق ) بەرەیی و نەتەوەیی و تایفە گەریەکان لە نێوانیاندا گوێی پێ نادرێ ، بەڵکو هەموویان وەکو یەك وان و دەسەڵاتدارو بێ دەسەڵات لە نێوانیاندا نیە ، وە بە چاوی سووك تەماشای هیچ کامێك لە ڕۆڵەی نەتەوەکەمان ناکەن وە هیچ کامێکیان بەلایەوە شورەیی نیە کە تێکەڵاو بێت (کۆبێتەوە) لەگەڵ برا مسوڵمانەکەی لە ترسی ئەوەی کە تووشی چڵك و پیسی بێ لە ئەنجامی ئەم تێکەڵاو بوونەی لەگەڵ براکەیدا ، وە هەروەها هیچ کوسپ و تەگەرەو پەردەیەك لە نێوانیاندا نیە دەربارەی ژن و ژن خوازیی و خزمایەتیی و دانیشتن و تێکەڵاویی و خواردن ، وە لە ناو کۆمەڵدا بە هێزو بێ هێز ڕەچاو ناکرێت بە هۆی ئەو ڕەچەڵەکەی کە دەچێتەوە سەری یان ئەو پیشەیەی کە پێی هەڵدەستێ وە خۆی لێیان جیا ناکاتەوە بە تایبەتی بەو مافانەی کە تایبەتە بە ئەوەوەو شانازی بە بنەچەیەکەوە یان بە بنەماڵەیەکەوە یان بە چینێك لە کۆمەڵدا ناکات ، وە هەروەها مرۆڤ لە ناو کۆمەڵدا بە بەڕێزو قسە ڕەوا دانانرێت بە هۆی بنەماڵەوە یان بە هۆی ماڵ و دارایییەوە ، بەڵکو کاتێك مرۆڤ ڕێزی لێ دەگیرێت لە نێو ئەو کۆمەڵەدا کە بە خوو ڕەوشتی بەرز لە ناو خەڵك خۆی جوان و

شیرین کردبێت ، وە لە هەموو کەس زیاتر خۆی لـە تاوان بپارێزێتو ترسی خوای لە دڵدا بێ ئەوە کۆمەڵێـــکە بە هۆی ڕەچەڵەكو ڕەنگو جوگرافیاوە سنووری بۆ دیاری ناکرێت ، بەڵـکو بۆی هەیە زیاتر لـەو سنوورە ببڕێتو بە نێو هەموو قوژبنێکی سەر زەوی‌دا بگەڕێت ، تاکو لە سەر ئەم بنچینەیە برایەتی‌یەکی مرۆڤانەی جیهـانی بنیات بنرێت : بەڵام کومەڵگاکانی نەتەوەیی‌و نیشتمان پەروەری بۆیان نیە کە بەشداری بکەن تەنها لەو ڕەچەڵەكو نیشتمانە تایبەتیە نەبێت کـــە دەچنەوە سەری ، وە دەرگای هامو شۆکردن دادەخەن لە هەموو ڕۆڵەکانی ئادەمیزاد کـە لە خۆیان نەبن . بەڵام کۆمەڵگەی ئیسلامی کە کۆمەڵگەیەکی خاوەن بیری بیرۆزو ڕەووشتی بەرزە هەموو کاتێك دەرگای لە سەر پشتە بۆ هـەموو ئەوانەی کە بڕوایان بە یەك بەرنامە هەبێتو خاوەنی خوو ڕەووشتێـکی ڕێك بن ، بۆ ئەوەی بەشداری ئەو کۆمەڵە بکەنو بگەن بە مافەکـــانی خۆیان وەکو هەر یەکێك لەو کۆمەڵـگایەدا بە شێوەیەکی یەکسانی ، لـە دوایدا ئەو کەسانەی کە بڕوایان بە بیرو باوەڕی ئیسلام نیە ئاینی ئیسلام هەر چەندە وەکو تاکەکانی لە ژێر بەیداغی ئیسلامدا دەژین سـەیریان ناکات ، بەڵام لە هەمان کاتدا بە سۆزی مرۆڤایەتی گشتی دەیان گرێتەوەو مافە سرووشتی‌یەکانی مرۆڤایەتیان لێ زەوت ناکات : وە شتێکی ڕوونو ئاشکرایەو ، لە هیچ کەس شاراوە نیە ئەگەر هاتو دوو برا جیاوازیان لە بیرو باوەڕدا هەبوو وە هەر یەکەیان بە ڕێبازێکی جیاوازدا دەڕۆیشت لە ڕەووڕەوەی ژیانی‌دا ، ئەوە مانای وانیە کە پەتی وەچەو برایەتی لـــە نێوانیاندا پچڕاوە ، وە هەروەها ئەگەر وەچەی مرۆڤایەتی دابەش دابەش کرا یان دانیشتوانی ناوچەیەك لە ناوچەکانی زەوی دابەش کرا بۆ دوو تایەفە یەکێکیان بڕوای بەم بەرنامەو بنچینەکانی هەبوو ، وە ئەوی دیکەیان بڕوای پێ نەبوو هیچ گومانی تێدا نیە کە هەر بەم شێوەیە جیا دەبنەوە بۆ

دوو کۆمەڵی یێك جیاواز ، بەڵام برایەتی‌و ،رۆڤایەتی ، بەردەوام لـــە نێوانیاندا هەیە ، وە لە ســـەر بنچینەی ئەم مرۆڤـــایەتی‌و هاوبەشی‌یە کۆمەڵـــگەی ئیسلام بە گوێرەی کە دەگونجێ بیری لێ بکرێتەوە لـــە مافەکانی ئادەمیزاد سەلماندویەتی‌و داویەتی بە کۆمەڵگاکانی تری بێجگە لە ئیسلام • ئینجا کە پایەکانی یاسای کۆمەڵی ئیسلامەت ناسی وەرە با پێـکەوە دەست بـکەین بە لێ کۆڵینەوەو چاو گێڕان لەو بنچینەو پرۆگرامـە کردەوەیی‌یانەی کـــە ئیسلام نەخشەی بۆ کێشـاون بۆ هەموو لایەنەکانی یارمەتی‌و پاڵپشتی یەکتری‌و مرۆڤـــایەتی : وە یەکـــەم دامەزراوو گرنگترین‌و مەبەستی ترینیان لە کارو باردا لە کۆمەڵگای مرۆڤایەتی دا (داڵە)وە لە ناو ماڵدا چەند تاکێك هەڵ دەکـــەوێ وە بە هۆی هاوســـەری ژنی‌و مێردایەتی وە بە هۆی ئەو هاوسەریەتی‌یەوە بنەچەیەکی تازە دێتە بوونەوەو چەندەها لکی خزمایەتی‌و ئاشنایەتی‌و هۆزایەتی لێ دەبێتەوە ، وە بەردەوام ئەو پەیوەندی‌یە پەرە دەستێنێت‌و فراوان دەبێت تاکـــو باڵەکانی بلاو دەکاتەوە بەرەو کۆمەڵگەیەکی فراوان‌و بەربلاو • ئینجـــا خێزان ئەو دامەزراوەیە کە هەموو وەچەیەك ڕۆڵەکانی مەشقی تێـــدا دەکەن وە ئامادەیان دەکـــات بۆ هەڵگرتنی سەر پەرشتی شارستانیەتی مرۆڤایەتی گـــەورە ، بەو پەڕی خۆشەویستی‌و دڵ دانەوەو دڵسۆزی‌و ئامۆژگاری • جا ئەو دامەزراوە وە نەبێ تەکەکانی ئامادە بـــکات بۆ هێشتنەوەی شارستانیەتی مرۆڤایەتی‌و گەشە کردنی‌و بەس ، بەڵـــکو ئەو دامەزراوە خۆشەویستی دەخاتە ناو دڵ‌و دەروونیانەوە بۆ ئەوەی کەمیان لە هەموویان باشترەو کارو بار چاکتر دەبات بە ڕێوە بیکەن بە جێ‌نشینی خۆیان ، وە ئەو ڕاستی‌یەی کە لەم ڕووەوە لا ملی لێ ناکرێ ، ئـــەوەیە کـــە خێزان ڕەگ‌و ڕیشەی بنچینەی شارستانیەتی مرۆڤە ، وە ئـــەو شارستانیەتە بەندە لە سەر ڕاستی‌و دروستی ئەو ڕەگ‌و ڕیشـــەیە ، هەر

له بەر ئەوەشە دەبینین کە یەکەم شتێك کە ئاینی ئیسلام گرنگی پێداوە لە مەسەلەکانی کۆمەڵ بنیات نانی دامەزراوی خێزانە ، وە بڕیاری لـــە سەر دەدات کە دابمەزرێت لە سەر باشترین و پتەو ترین بنچینە ٠ ئــەو شێوە ڕاستە بێ وێنەیەی کە لە نێوان پیاوو ئافرەتدا هەیە لە پەیوەندی هاوسەری ژن و مێردایەتی لە ڕوانگەی ئیسلامەوە ئەوەیە : کە هەر یەکێك لەوان ڕازی بێت بە هەستان بە هەڵسوڕاندنی کارو باری ژیانیان بــە پێی ئەوەی کە بۆی دیاری کراوەو لەگەڵ سروشتیدا دەگونجێ ، بۆ ئەوەی لە سەر ئەم بنچینەیە ماڵ و تێکەڵاوی و هاوسەریەکی ڕێك دابمەزرێت ٠ وە ئاینی ئیسلام هیچ شتێکی هیچ و پووچ بە کەم سەیر ناکات وە ئــەو پەیوەندی‌یە نا شەرعیەی کە لە نێوان پیاوو ئافرەتدا پەیدا دەبێت بـــە گاڵتەو گەپی سرووشت سەیری ناکات و وەکو شتێکی سووك و ناشیرین ڕەفتاری لەگەڵدا ناکات ، بەڵــکو ئەو تێکەڵاویە ناڕەوایی‌یە لە ڕوانگەی ئیسلامەوە تووشی بنچینەکانی شارستانیەتی مرۆڤایەتی دەبێت و هەڕەشەی ڕووخان و لە ناوچوونی لێ دەکات ٠ وە ئاینی ئیسلام وێنــەی ئــەم پەیوەندی‌یە قەدەغە دەکات ، وە بە تاوانە یاسایی‌یەکانی دەداتە قەڵەم ، وە بۆ هەر کەسێك کە بەم کردەوە هەڵسێت لە ناو کۆمەڵدا تۆڵـــەو سزایەکی توندو تیژی بۆ بڕیار داوە ئەمەش بۆ ئەوەیە کە لــە ناو کۆمەڵدا ئەم جۆرە پەیوەندی‌یانەی دەبنە هۆی بنەبڕ کردنی شارستانیەتی مرۆڤایەتی بڵاو نەبنەوە ، وە بۆ ئەوەی ئەو کۆمەڵە پاك ببێتەوە لـــەو پاڵنەرانەی کە ژن و پیاو هان دەدەن بۆ دروست بوونی ئەم جــۆرە پەیوەندی‌یە ناڕەوایەی کــە هیچ ســـەر پەرشتیەکی لە ژێردا بەدی ناکرێت ٠

وە یاساکانی ئیسلام دەربارەی خۆ داپۆشینی ئافرەت ( حجـاب )و قەدەغە کردنی تێکەڵاوی پیاوان و ژنان و قەدەغــە کردنی بڵاو بوونەوەی

گۆرانیو سـووڕدانو خراپەکـاریو بلاو بوونەوەیان تەنها بۆ ئـــەم مەبەستەیە : وە مەبەستی هەرە بەرزو ڕاستەقینەشی بەهێز کردنی خێزانو پاراستنیەتی لەو شتانەی کە دەبنە هۆی بێ هێزیو توانەوەی ئادەمیزاد • ئەوەش لــە لایەکەوە وە لە لایەکی ترەوە ئاینی ئیسلام تەنها نەوەستاوە بە وەی کە ڕێــگە بدات بۆ پەیوەندیەکی شەرعی لە نێوان پیـاوانو ئافرەت داو بەس بەڵـکو ئەم پەیوەندیە شــەرعیە بە کردەوەیەکی خێرو چاكو بەندایەتی خوای دەزانێ •

وە هــەر لە بەر ئەمەشە کە ئاینی ئیسلام ژن نەهێنانو شــوو نەکردنی (ڕەبەنی) بە شێوەیەکی زۆر توندو تیژ دەبووغزێنێ • بۆیـــە دەبینین ئاینی ئیسلام هانی هەموو گەنجێك دەدات کــە بیخاتە ئەستۆی خۆی ئەوەی کە دایكو باوکی لە پێش ئەودا خستویانەتە ســــەر شانی خۆیان بۆ هەڵـوڕاندنی کارو باری شارستانیەت •

وە هەروەها ئاینی ئیسلام گۆشە نشینی (الرهبانیة) بە کارێکی باش نازانێ بەڵـکو بە دروست کراوێـکی (بدعه) خراپی دەزانێو پێچەوانەی سرووشتی خوایە •

وە دیسان ئاینی ئیسلام بە چاوێــکی باش سەیری ئەم باوو نەریتانە ناکات کە دەبنە هۆی گران کردنی باری ژن هێنان لە سەر پیاو ، بەڵــکو دەیەوێت کە ژن هێنان بـکات بە ئاسان ترین کار لە نێو کۆمــەڵدا ، وە داوێن پیسیشی بە ناشیرین ترین کار دەداتە قەڵەم • جا هەر لە بەر ئــەم مەبەستەشە کە ئاینی ئیسلام ژنو ژن خوازی قەدەغە نە کردووە تەنهـا ئەو خزمــە نزیکە تایبەتیانە نەبن کە پێمان ناشێن وەکو دایكو خوشكو پوورو کچی براو کچی خوشكو دایكو خوشکی شیری ، وە بێجـــگە ئەوانە ڕەوایە بۆ پیـاو هــەر کاتێك ئارەزووی لێ بوو لە خزمەکـــانی

دیکەی دووری دەتوانی بیان کات بە هاوسەری ژیانی ، وە ئاینی ئیسلام جیاوازی‌یە تایفە گەریەکانی بنەبڕ کردووەو بنچینەکانی تێك شکاندووە • جا مادام وایە ڕێگا دراوە بە هەموو مسوڵمانان بە گشتی کە ژنو ژن خوازی لە بەینی خۆیاندا بکەن،وە لە هەمان دات‌دا فەرمانیان پێ دەکات بە سووكو ئاسان بیبەن بەڕێوە ، وە هەروەها لە مارەیی‌و کەلو پەلی‌دا ئەندازەیەکی مام ناوەندی بڕیار بدەن بە شێوەیەکی وا کە هەردووکیان توانای هەڵگرتنیان هەبێ ، وە لە ڕوانگەی ئاینی ئیسلامەوە بڕینی مارەیی پێویست بە داو پرس (قاضی)و شەرع زان (مەلا) ناکات چونکە لە ڕاستی‌دا بڕینی مارەیی لە کۆمەڵگەی ئیسلامدا پیشەیەکی ئاسانەو دەتوانرێت جێ بەجێ بکرێت بە ڕەزامەندی هەردوو لا واتە ( ژنو مێرد )و دوو شایەدی ڕاستگۆو دەست پاك ، بەڵام وە نەبێ بڕینی ئەم مارەیی‌یە بە شێوەیەکی نهێنی‌و پەنهان بێت ، بەڵکو پێویستە لە دێو گەڕەكو ناوچەدا ئاشکراو دیار بێت •

وە ئاینی ئیسلام پیاوی کردووە بە سەردار بە سەر ئافرەت‌دا بۆ بەڕێوە بردنی کارو باری ناو ماڵ ، بۆ ئەوەی لە سەر بنچینەیەکی پتەوو یاسایەکی جوان دایمەزێنێ ، وە هەروەها فەرمانی بە ئافرەت کردووە بۆ گوێ ڕایەڵی مێردەکەی‌و ، خزمەت کردنی ، هەروەها فەرمانی بە منداڵەکانی کردووە بۆ گوێ ڕایەڵی کردنی دایك‌و باوکیان‌و خزمەت کردنیان •

وە ئاینی ئیسلام یاسایەك بە باش نازانێ کە ببێتە هۆی درووست بوونی ئاژاوە لە ناو ماڵ‌و نەبوونی سەر پەرشتی کەرو کەسێك نە بێ کە بەر پرسیار بێ لە خوو ڕەوشتی خاوو خێزانی ناو ماڵ‌و کارو باری ژیانی ڕۆژانەیان‌دا • جا مادام شتێکی ڕوون‌و ئاشکرایە کە ناگونجێت

یاسای هیچ ماڵێك له ماڵان به بێ سەر پەرشتی کەرو مشور خۆر بەرێت بەڕێوه ، خۆ دیاره که خاوەن ماڵ لێ هاتوو ترو شایسته ترین کەسه بۆ ئەم سەر پەرشتی‌یه بەرزه له ڕوانگەی ئیسلامەوه ، بەڵام ئەمەش مانای ئەوه نی‌یه که ئایینی ئیسلام پیاوی کردبێت به سەر پەرشتی کەرێکی زۆر دار له سەر ئەندامەکانی ئەو خێزانەو بەڕێوه بردنی کارو باریان به ئارەزووی خۆی ، وه ئافرەتیشی کردبێت به کەنیشکەی پیاوو هیچ دەورێکی نەبێت بۆ بەڕێوه بردنی کارو باری ناو ماڵ .

وه سۆزو خۆشەویستی دوو بناغەی ڕاستەقینەن بۆ دامەزراندنو بەڕێوه بردنی خێزان له ئیسلامدا . جا ئەگەر پێویست بێت له سەر ئافرەت که گوێ ڕایەڵی مێردەکەی بکات هەر بەم شێوەیەش پێویسته له سەر مێرد به گوێرەی توانا سەرداریەتی‌و دەسەڵاتی خۆی به کار بێنێ لەو شتانەدا که دەبنه هۆی هێنانه دی کامەڕانی‌و خۆش بەختی خێزان ، وه نابێت ئەم دەسەڵاته به کار بهێنێت له زوڵمو ستەمدا ، وه ئایینی ئیسلام نایەوێت پەیوەندی ژنو مێردایەتی بەردەوام بێت له سەر بنچینەی سۆزو خۆشەویستی‌و تێکەڵاوی کردنێکی ڕێكو پێك نەبێت ، بەڵام ئەگەر هاتو ئەو سۆزو خۆشەویستی‌یه نەما لێرەدا ئایینی ئیسلام پیاو دەکاته سەر پشك که ژنەکەی تەڵاق بدا . وه ئافرەتیش بۆی هەیه داوای جوودا بوونەوەی بکات له مێردەکەی بەو مەرجەی که ئەو مارەیی‌یەی بداتەوه به پیاوەکه که وەختی خۆی له سەری مارە کراوه ، وه هەروەها دادگای ئیسلامیش سەر پشك دەکرێت بۆ هەڵوەشاندنەوەی ئەم پەیوەندی‌یه ، هەر کاتێك ناکۆکی کەوته نێوان ژنو مێردەوه . وه نزیکترین دەرگا له دوای ماڵ دەرگای خزمو کەسو کاره .

ئایینی ئیسلام دەیەوێت ئەو کەسانەی که پەیوەندیان لەگەڵ

یەکتردا هەیەو لەگەڵ یەکتردا تێکەڵاو بوون • بە باوەکایەتیو برایەتیو ژنو ژن خوازی ، کە گیانی یارمەتیو پشت بە یەك بەستنو دڵ نەوایی لە نێوانیانرا بڕوێنێت •

وە خوای باڵا دەست لە پەرتووکە پیرۆزەکەی (قورئان)دا زیاتر لە چەند شوێنێك فەرمانی پێمان کردووە چاکە لەگەڵ خزمو کەسو کارو هۆزەکەماندا بکەینو سۆزی خۆمانیان بۆ دەرخەین ، وە هەروەها لە فەرمایشتە پیرۆزەکانی پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) باسی چاکە کردنو هاموشۆ کردنی خزمو کەسو کار چەندەها جار دوو بارە کراوەتەوە ، وە بە گەورە ترین چاکە دادەنرێت لە خزمەت خوا •

وە خراپترینو ناخۆشەویست ترین کەس لە ڕوانگەی ئیسلامدا ئەو کەسەیە کە بە ناشیرین شێوەو خوو ڕەوشت هەڵسو کەوت لەگەڵ خزمو کەسو کارو هۆزەکەیدا دەکات ، بەڵام ئاگادار بەلەوەی کە گوایە خۆشەویستیو دەمارگیری پیاو بۆ خزمەکانی لە کاری چاکەو خراپەدا شتێکی باشەو ئیسلام ڕێگەی داوە ! نەخێر : بەڵکو لە ڕاستیدا یارمەتی دانی پیاو بۆ دەمارگیریەتیو ڕێگەی خراپەو لادان لە ڕاستیدا بەرامبەر بە خزمەکانی ئاینی ئیسلام بە هەڵوێستێکی نەفامانەی دەداتە قەڵەم •

وە هەروەها ئەگەر پیاوێکی فەرمانبەری دەوڵەت هەڵسا بە جێ بەجێ کردنی پێویستیەکانی خزمانی لە سەر ماڵو دارایی گەل ، وە یان دەستی یارمەتی بۆ ڕادەکێشانو لە داد پرسیدا بە بێ ڕەواو بەڵگە لایەنگری دەکردن ئەمەش هەر دوورە لە داد گەری ئیسلام •

بەڵکو ئەوە وەسوەسەی شەیتانە خستویەتیە ناو دەروونیەوە بەڵام

مەرجی یەکەم بۆ بەجێ هێنانی پەیوەندی خزمایەتی‌و سەر لێ دانیـان کە ئاینی ئیسلام فەرمانی پێمان کردووە ئەوەیە پیاوەکە خۆی پیاوێکی باش‌و چاکە کەر بێ‌و لە ناو چوار چێوەی هەق‌و ڕاستی‌و داد گەری‌دا بێت • لە دوای‌دا نزیکترین پەیوەندی دوای پەیوەندی خزمـەیەتی پەیوەندی دراوسێ‌یەتی‌یە ، دراوسێ هـەر وەکو ئاینی ئیسـلام فەرمووی‌یەتی سێ جۆرە : (١) دراوسێی خزم (٢) دراوسێی بێـگانە (٣) هاوڕێی بێگانە ، ئەمەشیان ئەو کەسەیە کە بووە بەهاوڕێت لـە سەفەرێکدا ، یان هاوبەشتە لە کارێك‌دا ، یان لە تەکتا دانیشتووە لـە کۆڕێك ، یان لە مزگەوت ؛ هەموو ئەوانە شایستەی چاکـەو سۆزو خۆشەویستین زیاتر لە خەڵکی دیـکە ، هەر وەکو حەزرەتی عائشە ( رضی الله عنها ) بۆمـان دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ( صلی الله علیه وسلم ) کە فەرموویەتی : ( ما زال جبریل یوصیی بالجار حتی ظننت انه سیورثه ) رواه الاربعة :ـ

واتە : بـەر دەوام حـەزرەتی جوبرائیل دەر بارەی دراوسێ ئامۆژگاری دەکردم تا وام گومان برد کە دەیکاتە میرات گری •

وعن ابي شريح ( رضی الله عنه ) أن النبي ( صلی الله عليه وسلم ) قال : ( والله لا يؤمن ، والله لا يؤمن ، والله لا يؤمن ، قيـل مَـن يارسول الله ؟ قال : الذي يأمَنُ جاره بوائقَهُ ) رواه البخاری ومسلم•

واتە : شورەیح بۆمان دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ( صلی الله علیه وسلم ) کە فەرموویەتی (سوێند بە خوا بڕوای نی‌یە ، سوێند بە خـوا بڕوای نی‌یە ، سوێند بە خوا بڕوای نی‌یە ، گوتیان کێ ئەی پێغەمبـەری خوا فەرمووی ئەو کەسەی کە دراوسێ‌کەی لـە شەڕو ئازاوەی ئەمین نەبێت •

وروي عن النبي ( صلى الله عليه وسلم ) : قال : ليس المؤمن الذي يشبعُ وجاره جائع ) رواه البخاري •

واته : له پێغەمبــەرەوە ( صلى الله عليه وسلم ) فەرموویەتی : بڕوا دار ئەوە نیە کە بۆ خۆی تێرەو دراوسێکەی برسی‌یە •

( قيل للنبيّ ( صى الله عليه وسلم ) يا رسول الله انّ فلانة تقوم الليلة وتصوم النهار وتفعل وتصدق وتؤذي جيرانها بلسانها ، قال : رســول الله ( صلى الله عليه وسلم ) لا خير فيها هي من اهل النار ، قالوا : ( وفلانة تصلي المكتوبة وتصدق باثواب ولا تؤذي احداً ) فقال رسول الله ( صلى الله عليه وسلم ) هي من اهل الجنّة ) رواه البخاري في كتاب الآداب •

واته : ( بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) گوترا ئەی پێغەمبەری خوا فلانە ئافرەت بە شەو نوێژ دەکاو بە ڕۆژ بە ڕۆژو دەبێ‌و کار دەکاو خێرو چاکە دەکاو لە هەمان کاتدا ئازاری دراوسێکەی دەدا ) پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ووتی : (ئەمەش باش نیەو ئەم ئافرەتە بە زمـان نە ئاگری دۆزەخە ( ، وە گوتیان ئەی پێغەمبەری خــوا ( فلانە ئافرەت پێنج نوێژەکان دەکاو جل‌و بەرگ دەبەخشێ‌و ئازاری هیچ کــەسێك نادات ) ، پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) فەرمووی : ( ئەم ئافرەتە لە ئەهلی بەهەشتە ) •

قال النبيّ ( صلى الله عليه وسلم ) : يا أبا ذر اذا طبخت مرقةً فأكثر ماء المرقَة وتعاهد جيرانك أو أقسم في جيرانك ) رواه البخاري •

پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) فەرمووی ( ئەی ئەبا ذر ئەگەر شلەیەکت لێنا ئاوی زۆر تێکەو بانگی دراوسێکەت بکەو یان بەشی جیرانەکەتی لێ بدە •

بوختەی قسان ئەوەیە : کە ئاینی ئیسلام دەیەوێ تەبایی دروست بکات لە نێوان ئەو کەسانەی کە پەیوەندی دراوسێیەتییان بە یەکەوە هەیەو بیان کا بە یەك لە هەمموو خۆشیو شادیەکیاندا • وە پەیوەندی متمانەو پشت بە یەك بەستن لە نێوانیاندا پەیدا بکات ، بۆ ئەوەی هەمە یەکێك لە وان دڵنیا بێت لەوەی دیکەیان ، لە سەر خۆیو ماڵو دارایی‌و نامووسی ، ئا ئەمەیە پەیوەندیو دەستورو یاسای ئیسلامی • بەڵام هەڵس‌و کەوتی ئەو دوو دراوسێیانەی کە لە یەکتری نیزیکن‌و هیچ شتێك لە نێوان ماڵەکانیاندا نیە بێجگە لە دیوارێك وە بە درێژایی ژیانیش یەکتری ناناسن ، وە ئەوەی کە ئەبینن هیچ خۆشەویستی یەك نییە لە نێوان دانیشتوانی گەڕەکەکاندا ئا ئەمانە هیچیان ناگونجێن بە هەڵس‌و کەوتی ئیسلامی دابنرێن : لە دواییدا ئەم پەیوەندییە نیزیکانە دەرگای چەند پەیوەندییەکی فراوانی ترمان ڕو بە ڕو دەکەنەوە ، وە هەموو کۆمەڵی مسوڵمانان دەگرێتەوە ، جا فەرموو تۆو چەند نموونەیەك لەو بنچینەو پایانەی کە ئاینی ئیسلام لە سەر ئەم دەزگا فراوانەدا ژیانی کۆمەڵایەتیمانی لە سەر بنیات ناوە :

(١) ـ ( وَتَعاوَنوُا عَلَى الْبِرِّ وَالتَّقوى وَلا تَعاوَنوْا عَلَى الْأِثْمِ وَالْعُدْوَان ) المائدة (٢) •

واتە هاوکاری یەکتری بکەن لە سەر چاکەو لە خوا ترسان ، وە هاوکاری یەکتری مەکەن لە سەر خراپەو دوژمنکاری •

(٢) ـ ( كُنْتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنْكَرِ ) آل عمران (١١٠) •

واتە : ئێوە چاکترین گەل بوون کە خوای گەورە ناردونی بۆ

خەڵك فەرمان دەکەن بە چاکەو قەدەغەی خراپە دەکەن •

(٣) ـ ( ا ِياكم والظن فان الظن اكـــذب الحديث ولا تجسسوا ولا تنافسوا ولا تحاسدو ولا تباغضو ولا تدابروا وكونوا عباد الله اخوانا ( رواه مسلم •

واتە : ئاگاداری خۆتان بکەن لە گومان بردن چونکە گومان درۆ ترین‌شتە ، وە جاسوسی مەکەن ، وە چاو چنۆك مەبن ، وە حەسود مەبن، ڕقتان لە یەکتری نەبێتەوەو ، پشت لە یەکتری مەکەن‌و بین بە بەندەی خواو برای یەکتری •

(٤) ـ ( مَن احب لله وابغض لله وأعطى لله ومنع لله فقد استكمل الأيمان • المصابيح باب الايمان •

واتە : هەر کەسێ خۆشویستن‌و ڕق لێ هەستان‌و بەخشین‌و نــە بەخشینی بۆ خوا بوو ئەوە بڕوای تەواوە •

(٥) ـ ( مَن مشى مع ظالم ليقويه وهو يعلم انه ُ ظالم فقد خرج من الأسلام ) •

واتە : هەر کەسێك لەگەڵ ستەم کارێکدا بڕوا بە ڕێدا بۆ ئەوەی بە هێزی بکاو بیپارێزێ لە هەمان کاتدا بزانێ کە ئەو کەسە زۆر دارە هیچ گومانی تێدا نیە لە ئیسلام دەچێتە دەرێ •

(٦) ـ ( لا يؤمن احـــدكم حتى يحب لأخيه ما يحب لنفسه ) رواه الخمسة •

واتە : هیچ کەسێك لە ئێوە بڕوای تەواوی نا بێت تا وەکو پێی خۆش نەبێ بۆ برا مسوڵمانەکەی ئەوەی کە بۆ خۆی پێی خۆشە •

# یاسای ئابووری

ئایینی ئیسلام چەندین سنوری دیاری کردووەو چەندین بنچینەی داناون بۆ ئەوەی کارو باری ئابووری ئادەمیزاد لە سەر چەندین بنچینەی هـــەق‌و ڕاستگۆی‌و داد پەروەری‌و دەست پاکی دابمەزرێت ، وە وای بڕیار داوە کە یاسای بەڕێوەبردنی کارو بارو بە دوا ماڵ‌و دارایی‌و بـــە دەست خستن‌و بەخشیندا جێ بەجێ نە کرێت تەنها لە چوار چێوەی ئەو سنورە دیاری کراوانەدا نە بێت کە بۆی دیاری کراوە ، بە ەوو لێی لا نەدات .

بەڵام ڕێبازەکـــانی بە دەست هێنـــانی ماڵ‌و دارایی‌و شێوازی هەڵسوڕاندن‌و دەستاو دەست پێ کردنی ئایینی ئیسلام بچوکترین گرنگی پێ نادات ، بەڵـــکو وازی لێ دێنێت بۆ هاتنە کایەوەو تازە بوونەوە لـــە هەموو کات‌و سەردەمێکدا ، چونکە ئەمانە لەو شتانەن کە شان بە شـــای شارستانیەتی تازەو گۆڕانـــکاری تازەدا دەڕوا ڕۆژ لەدوای ڕۆژ ، وە بە پێی بارو دۆخ‌و پێویستەکانی خەڵـــکی یێك دەهێنرێن‌و دیاری دەکرێن ، لە هەموو قۆناغە جیاجیاکانی ژیان . وە ئایینی ئیسلام دەیەوێ کـــە ئەم بنچینانە پشت گوێ نەخرێن‌و ئەم سنورانە نەشکێنرێن هەر چەندە کـــە باری ئابووری مرۆڤایەتی بگۆڕدرێت‌و لە چەندەها قالبی جۆراو جۆردا خۆی دابڕێژێت ، بەڵـــکو پێویستە چاودێری بکرێت‌و ڕێزی لێ بگیرێت، لە هەموو ئەو شتانەی کارو باری ئابووری ئادەمیزاد هەڵی دەبژێرێت لـــە

بارو زروفو شێوازی جیا جیا له هەموو چەرخو سەر دەمێکدا • وه لـه ڕوانـگەی ئیسلامەوه ، خـوای گەوره زەوی‌و ئەوەی که تێیدایەتی دروستی نه کردووه تەنها بۆ بەرەی ئادەمیزاد نەبێ ، جا که وابوو مافی هەموو ئادەمیزاددێکه لەو لایەنەی کـــه ئادەمیزاده هەر له سەرەتایی بوونیەوه که هەوڵی به دەست هێنانی ڕزق‌و ڕۆزی بژیوی خۆی بدات له سەر خوانی ڕاخراوی نیعمەتەکانی خوای گەوره که له بەر دەستی بەندەکاندا له سەر زەوی ڕاخراوه ، وه ئەو مافەش هـــەموو بەرەی ئادەمیزاد تێیدا هاو بەشن‌و وەکو دەنـکی شانه تێ‌یدا یەکسانن ، وه هیچ کەسێك لـــه گەیشتن بەو مافه سروشتیه بێ بەش ناکرێت ، هیچ کامێکیان له سەر یەکتری به گەوره ترو زیاتر دانانرێت ، وه بەر نامـەی ئیسلام ڕێـگا نادات هەندێك له ئەندامەکانی کۆمەڵ وه یان چـەند خێزانێك‌و چەند چینێك قەدەغه بکرێت لـــه کەڵك لێ وەرگرتنی‌دا به شێوەیەك کـه بۆیان نه بێت کەڵك له هێندێك هۆیەکـانی وه دەست هێنانی ڕزق‌و ڕۆزی وەربگرن‌و دەرگای هەندێك کارو پیشەیان له سەر دابخرێت ، وه هەروەها به پێی یاسای ئیسلام ڕەوا نیه بریار له ســـەر ئەو جیاوازی‌و تایبەت کارانه بدرێ کـه دەبێته هۆی ئەوەی هەندێك چین وه یان هەندێك ڕەچەڵەك وه یان هەندێك بنه ماڵه تایبەت بکرێن لـــه هەندێك هۆی به دەست هێنانی ڕزق‌و ڕۆزی‌و ڕێـگاکانی ژیان بـه بێ هاوبەشی کردن‌و بەشداری کردنی خەڵـکی دیکه ، وه هەموو بـەرەی ئادەمیزاد یەکسانن له مافی هەوڵ دان بۆ وه دەست هێنانی ئەوەی کـــه خوا له سەر زەوی بڵاوی کردۆتەوه له هۆیەکانی به دەست هێنـــانی ڕۆزی ئادەمیزاد • له بەر ئەوەی پێویسته لەم هەوڵەدا ڕێـگا بدرێ بـه هەر یەکێك لەوان له هەر شوێنێك بێت • وه هـــەموو نازوو نیعمەتێك ئەگەر هات‌و بۆ وه دەست هێنان‌و چاك کردنی کارو بارەکانی پێویستی به

هەوڵو تێکۆشانو لێ هاتووی مرۆڤ دەکرد ، ئەوە لەو کاتە ڕەوایە بۆ هەموویان کە بە ئەندازەی پێویستی‌یان سوودو کەڵکی لێ وەربگرن ، کەواتە ئاوی ڕووبارو سەر چاوەکانو داری دارستانەکانو بەرو بوومی میوەجاتی درەختە خۆ ڕسكو بێ خاوەنەکانو گژو گیاو هەموو ڕووەکەکانی سەر زەوی‌و ئاوو هەواو گیان لە بەرانی بیابانو کانزا گشتی‌یەکانی سەر زەوی‌و وێنەی ئەمانەش درووست نی‌یە کە تایبەت بکرێن بە تاکە کەسێکەوە ، وە یان بە کۆمەڵێکی تایبەتی‌یەوە ، کە دەستیان بە سەردا بگرنو پاش قوونیان بدەن (احتكار)وە یان لە ڕووی بەندەکانی خوادا دەرگایان لە سەر دابخەن تاکو نەتوانن بە بێ کرێ سوودو کەڵکی لێ وەر بگرن . بەڵام ئەو کەسانەی دەیانەوێ ئەندازەیەکی زۆر لەو شتانەی بۆ خۆیان دابڕن بۆ مەبەستی بازرگانی کردن . ئا لەو کاتەدا میری ئیسلامی دەتوانێت کە سەرانەیان لە سەر دابنێت ، بەڵام ئەو شتومەکانەی کە خوای گەورە لە سەر زەوی‌دا بۆ بەرژەوەندی گشتی‌و کەڵك لێ وەرگرتنی دروستی کردون ، ڕەوا نیە کە پشت گوێ بخرێتو ڕابگیرێت بەڵکو ، لە سەر خاوەنەکەی پێویستە کە یەکێك لەم دوو ڕێگایانە بگرێتە بەر :ـ

١ ـ یان ئەوەتە خۆی بەکاری بهێنێ وە سوودی لێ وەربگرێت .

٢ ـ یان ئەوەتە وازی لێ بهێنێ بۆ خەڵکی دیکە ، بۆ ئەوەی کەڵکی لێ وەربگرن . ئینجا بە پێی ئەمە ڕەوا نیەو ، ڕێگا نادرێت بە هیچ کەسێك ، کە زەوی‌یەکەی زیاتر لە (٣) ساڵ ڕابگرێ ، ئەگەر لە ماوەی ئەو سێ ساڵەدا ئاوەدانی نەکردووە ، بە خانوو کردن لە سەری وە یان بە کشوکاڵ تێدا ڕواندن ئەوە دوای تێپەڕ بوونی سێ ساڵەکە حوکمی زەوی‌و زاری بێ خاوەنی بە سەردا دەدرێت ، هەر کەسێکی

دیــکه بێجگه له خاوەنەکەی پێشووی ویستی ئاوەدانی بکاتەوەو بەکاری بهێنێ ئەوە بۆ خاوەنە پێشوەکەی نیە له دادگادا هیچ داوایەکی له ســەر تۆمار بکات ، بەڵکو لەو کاتەدا دەوڵەتی ئیسلامی سەربەستی هەڵبژاردنی تەواوی بە دەستە بۆ دابڕینی پارچە زەوی‌یەکە بۆ هەر کەسێك کــه ئارەزووی لێ بێت ، بێجگه له خاوەنەکەی خۆی •

وە هەر کەسێك چەند مافێکی مڵك داریەتی بە چەند ڕێــگایەکی شەرعی‌و ڕەوا له جیهاندا به دەست هێنا ، هیچ گومانی تێدا نیە کــه ئەو مافانەی شایانی ڕێز لێ گرتن‌و ، پاراستنە لـــه هەموو کاتێکدا • وە بۆ ئەوەی بزانین که ئەم ملکە هەموو مەرجەکانی شەرعی تێدا کۆبۆتــەوە پێویستی بە لێکۆڵینەوەو باس کردن هەیە ، جا ئەوەی هەموو مەرجەکانی دروستی تێدا نەهاتبێتە کایەوە له ڕوانگەی شەریعەتی ئیسلامەوە ، ئــەوە لەو کاتەدا دەبێت له خاوەنەکەی بستێندرێتەوە • بەڵام ئەو مافەی کـــه شەریعەت‌و یاسای خاوەنایەتی بڕیاری له سەر داوە ئەوە بۆ هیچ کۆڕو یاساو دەوڵەتێك نی‌یە که دەستی بە سەردا بگرێت‌و لێ‌ی بستێنێتەوەو یان کەم‌و زیادی تێدا بکات ، وە بە هیچ شێوەیەك دروست نی‌یە له ســـەر زەوی خوادا ڕژێمێك پەیدا بێت به ناوی بەرژەوەندی گشتی‌یەوە دەست به سەر ئەو مافانەدا بگرێت ، که شەریعەتی ئیسلام بڕیاری لــه ســەر داون ، وە هــەر وەکو چۆن کــەم تەرخەمی کردن له بەدی هێنانی ئەو مەرجانەی کـــه شەریعەتی ئیسلام دیاری کردوون بۆ خاوەنایەتی تاك‌و چاوەدێری کردنی بەرژەوەندی کۆمەڵ به ستەم‌و دەست درێژی کردن بۆ سەر هەق دادەنرێ ، هەر بەم شێوەیە زیادە ڕەویش لــەم مافانەدا وە نەبێ حوکمەکەی کەم تر بێت له حوکمی کەم تەرخەمی کردن تێ‌یدا •

وە له ئەرکەکانی دەوڵەتی ئیسلامی ئەوەیە کــــه چـــاوەدێری

پارێزگاری مافە شەرعیی‌یەکانی تاکەکانی کۆمەڵ بکات ، وە ئەوەی کـە شەریعەت لە سەری پێویست کردوون لە مافە کۆمەڵایەتیەکـان لێیان وەرگرێت • وە خوای پەروەردگار گرۆی ئادەمیزادی درووست کردووە بەڵام لە دابەش کردنی نازو نیعمەتەکانیدا وەکو یەکی دانەناوون بەڵـکو بە پێی کـار بەجێی‌و ویستی خۆی هەندێکیان بە سـەر هەندێکیاندا بەرز کردۆتەوە ، وە ئەو جیاوازی‌یانەش لە نێوان بەندەکاندا بە ڕوونو ئاشکرایی کە لە چاکی‌و جوانی‌و دەنگ خۆشی‌و هێــزی لاشەیی‌و بێ هاتوویی‌و ژیری‌و ئەو ژینگەیەی کە تێیدا لە دایك بوونو چەندەهـــا شوێنی‌تر بەر چاو دەکەوێ ، وە ڕزقو ڕۆزیش هەر لـە هەمـــان شێوەیەدا بەش کردووە • وە ئەو سرووشتیەی کە خوای گـــەورە خستویەتیە ناو دڵی بەندەکانی‌یەوە وا دەخوازێت کـــە جیاوازی ڕزقو ڕۆزی لە نێوان بەندەکاندا وەکو هەموو بەخشش‌ەکانی دیکەی خـــوا وابێت ، وە لە ڕەوانـگەی ئیسلامـــدا هـــەموو ئەو یاسایانەی کـە هەڵدەبژێرینو ئامادە دەکرێن بۆ بەدی هێنانی ئەو یەکسانیە ئابووریی‌یە کە لە نێوان بەندەکاندا پڕوو پاگەندەی بۆ دەکرێ لە بنچینەدا پووچنو بێ نێوەرۆکن ، لە بەر ئەوەی ئایینی ئیسلام لە خودی ڕۆزی‌دا دان بـــە یەکسانی‌دا نانێت ، بەڵـکو لە هەلو مەرجی هەوڵو تێکۆشان لـە پێناو وە دەست هێنانی ڕزقو ڕۆزی‌و بژیودا دانی پێدا دەنێت • وە ئەوەی کە ئایینی ئیسلام دەیەوێت ئەوەیە کـە لە ناو کۆمەڵـگای ئادەمیزاددا هیچ شتێك لەو پەردەو نێوانە یاسایی‌و چاو نێ کەریانە نەبێت کە دەبنە هۆی لە کار خستنی ئادەمیزادو ڕاگرتنی لە بەردەم بەخشینی هەوڵو توانای‌دا بۆ بە دەست هێنانی بژیوی ژیانی‌و بە گوێرەی ئەو هێزو بەخششەی کـە خوا پێی بەخشیوە هەر وەکو دەیەوێت ئەو ئمتیازو جیاوازی‌یانە نەیەڵێت کـە خۆشی‌و ئاسوودەیەکی بە میرات بە جێ مـاو بۆ هەندێك چینو

ڕەچەڵەك‌و بنە ماڵە مسۆگەر دەكات ، وە بە شوورەیەكی پارێزگـــاری ئاسایی دەوری دەگرن • ئەم دوو ڕێـكایانەی كە لە سەرەوە باسمـان كردن جیاوازە سرووشتی‌یەكان‌و جیـــاوازە چینایەتیەكان بە زۆرە ملی دەگوێزنەوە بۆ چەند جیاوازی‌یەكی پڕو پاگەندە بۆ كراوو دوور لـــە سرووشت ، كە ئایینی ئیسلام قەدەغەیان دەكات‌و دەیەوێت بە سەریاندا زاڵ بێت ، وە بڕیار لە سەر یاسایەكی كۆمەڵایەتی وا دەدات كە لە سەر ڕێبازێـكی سرووشتیدا بڕوات‌و ، دەرگای هەوڵ‌و تێكۆشان بۆ هـەموو تاكێك لە تاكەكانی كۆمەڵ لە سەر پشت بێت ، وە ئەو كەسانەی دەیانەوێ بە زۆرە ملی لە هۆیەكانی هەوڵ‌و تێكۆشان‌و مافەكانیدا یەكسانی لـــە نێوان بەندەكانی خوادا بخـەن ئایینی ئیسلام پشت‌گیریان ناكات ، بەڵـكو زۆر بە توندی دژیان دەوەستێ ، چونكە ئەمانە دەیانەوێ جیـــاوازی سروشتی بگوازنەوە بۆ جیاوازی‌یەكی دوور لە سرووشت ، نزیـكترین ڕژێمیش بۆ سرووشت ئەوەیە : كە ڕێـگە بدات بە هەموو ئەندامێك لـە ئەندامەكانی كۆمەڵی ئادەمیزاد ، كە دەست بە بەڕێوەبردنی كـــاروانی ژیانی بـكات ، بە ژیانێـكی خۆش‌و بەختەوەرانە لەو ژینگەو بارو زروفەدا كە خوا بۆی ئامادە كردووەو بە سرووشت پێی بەخشیوە • بۆ وێنە ئەگەر یەكێك تواناو دەسەڵاتی هەبوو ئۆتۆمۆبێلێك بكڕێ ئەوە لەم كاتەدا بۆی هەیە بە ئارەزووی خۆی هاتو چۆی پێ بكات ، بەڵام ئەگەر یەكێك ئۆتۆمۆبێلی نەبوو ئەوە دەبێ بە پێیان بڕوا ، وە ئەگەر یەكێكیش لاقەكانی تەواو نەبوون ( واتا ئازاریان هـەبوو یان نوقسان بوون ) ئەوە لەو كاتەدا دەبێ بەدار شەق بڕوات • وە مەنعی بابای شەل‌و سەقەتیش ناكات كە سەیارەیەك بە دەست بهێنێت لە هەر قۆناغێك لە قۆناغەكـــانی ژیانی‌دا • وە هەروەها بۆ یاسای كۆمەڵگا ناگونجێت بڕیار بدات كـــە دەبێت ژیانی هەموو تاكێك لە تاكەكانی كۆمەڵگا لە یەك پلەو یەك بـــارو

گوزەراندا بێتو ، تا دوا قۆناغی ژیان پێـــکیانەوە بەستنەوە بە بێ لێك پچڕانو جیا بوونەوە ، ئەمە بە هیچ شێوەیەك ناگونجێ قانوونی عەدلو مام ناوەندی ئەوەیە کە دەرفەت بهێڵێتەوە بۆ هەر کەسێك کـە قۆناغی ژیانی بە شـەلو نوقســـانی دەست پێ کردبێت بـە هۆی هــەوڵو تێکۆشانیو لێ هاتوویی خۆیەوە بیەوێت کە لە ماوەی ژیانی داهاتوویدا ئۆتۆمۆبێلێك بە دەست بهێنێت بە مەرجێك نەبێتە هۆی درووست کردنی کارەسات لە بەردەم کەسێکی دیکەی وادا کە قۆناغی ژیانی بە خاوەنایەتی سەیارە دەست پێ کردووە • وە یان ببێتە هۆی لە ناو بردنی ئۆتۆمبیلەکە بە هۆی نەفامیو نەبوونی کارامەیی لە کاتی لێ خوڕیندا بە شێوەیەك کە نەتوانێ بە ڕێكو پێکی بڕوات بە ڕێدا ، وە ئاینی ئیسلام بەوە ناوەستێ کە پێش بڕکەی ئابووری لە ناو دەستەی کۆمەڵایەتیدا بۆ هەموو تاکێك لە تاکەکانی ئادەمیزاد بەشێوەیەکی داد پەروەرانە بێتو دەرگای لە سەر پشت بێتو بەس ، بەڵـکو لەگەڵ ئەمەدا وا دەخوازێت کە پێش بڕکێ کەران لە هەڵسوڕاندنی کارو باری ژیانیاندا دەبێت لە ناو خۆیاندا بـە بەزەییو دڵ نەواو یارمەتی دەری یەکتری بن ، وە نابێ لەگەڵ یەکتریدا دڵ ڕەقو توندو تیژ بن بە شێوەیەك کە هیچ کامێکیان ئاگای لە دراوسێو هاوڕێکەی خۆی نەبێت •

وە ئاینی ئیســـلام لــە لایەکـــەوە دەیەوێت بە هۆی تەعلیماتە ڕەوشتییەکانەوە گیانی یارمەتیو پشت بەستن لە ناو مێشکی خەڵـکیدا بڕوێنێ ، بۆ ئەوەی هـەموو ئەوانەی کە لە بارو گوزەرانێکی گونجـاودا ژیان دەبەنە ســەر ببن بە پاڵپشتو یارمەتی دەر بۆ هــەژارو دەست کورتەکانیان ، وە لە لایەکی دیکەشەوە بە پێویستی دەزانین کە کۆمەڵگا هیچ کاتێك خاڵی نەبێت لە دەزگاییەکی (المؤسسة)ی جێگیر بۆ دابیـن کردنو یارمەتی دانی ئەو یەك کەوتەو لێ قەوماوانەی کە هیچ ڕێگایەك

شك نابەن بۆ بە دەست هێنانی بژێویان لە ماوەی ژیانیاندا ، بۆ ئـــەوەی هەر کەسێك کە توانای نەبوو بەشی خۆی لەم پێش بڕکە ئابووریە دابین بـکات بڕوات لەم دەزگا ئیسلامی‌یەدا(١) بەشی خۆی بە دەست خـۆی بخات • وە ئەوانەش کە ڕۆژگار پەکی خستوونو ناتوانن بە بەردەوامی ژیانی خۆیان ببەن بە ڕێوە • وە ئەرکی سەرشانی ئەم دامەزراوە ئەوەیە کە مافی ئەو پەك کەتەو چەوساوانە دابین بـکات • وە هـــەر کەسێك پێویستی بە یارمەتی هەبێت بۆ دابەزینە نێو گۆڕەپانی هـــەوڵو کۆشش ئەوە لەو دەزگایەدا دەگات بە ئاواتو مەبەستەکانی • جا لە بەر ئـــەوە ئاینی ئیسلام پێویستی کردووە،وە بە حوکمی یاسا بڕیاری داوە کە هەموو سالێك ٥ر٢٪ لە ( سەدا دوو ونیو ) لە بەرو بومی داکراو سەرتاپای ماڵو دارایی بازرگانی وەربگرێ وە لە ١٠٪ ( سەدا دەو ) ، لە ٥٪ ( ســەدا پێنج ) لەو زەویانە وەربگیرێ کە بە ئاوی باران یان ڕوو بار دەچێنرێت •

وە هەروەها شەریعەتی ئیسلامی لە ٢٠٪ی پێویست کردووە لـــە دەست کەوتی هێندێك لە کانگاکاندا ، وە هەروەها پێویستی کردووە کـە بەشێکی دیاری کراویش لە مەڕو مالات بە گوێرەی جیاوازی ژمـارەیان وەربگیرێ •

دیسانەوە ئاینی ئیسلام پێویستی کردووە کە دەبێت ئەو داهاتانەی لەم ڕێگایانەوە بە دەست دەهێنرێن لە پێناو فریا کەوتنی هەژارو داماوو

---

(١) مەبەست لەم دەزگایە ئەوەیە کاتێك کارو باری مسولمانان بەپێی قورئانو سوننەت لە ژێر حوکمێکی ئیسلامیدا بەڕێوە برا ئەوە لەم کاتەدا دەزگایەکی تایبەت تەرخان دەکرێ بۆ کۆ کردنەوەی زەکاتی مسولمانانو دابەش کردنی بـــە ســـەر هـــەژارو نوقسانو لێ قەوماواندا •

وەرگێر

هەتیوو نەدارانیدا خەرج بکرێت • ئا ئەمە دابین کردنێکی کۆمەڵایەتی‌یە،
ئەستەمە لەگەڵ بوونی ئەم دابین کردنەدا ، کە ئادەمیزاد شتێك بهێنێت لە
پێویستیەکانی ژیانی دابین نە کرابێت • وە هەروەها پیاوێکی هەژار لـــە
ترسی هەژاریو نەداری رزقو رۆژی خۆی بە ئارەقی نێو چاوانی پەیدا
دەکات ، مەحاڵە مل کەچ بـکات بۆ هەموو ئەو مەرجە کرێ گرتەییە
ناڕەوایانەی کە لە لایەن خـــاوەن مڵكو کارگەکانەوە بـــە سەریدا
دەسەپێنرێت • وە بەو پێیە ناگونجێ توانایی هیچ کەس لە تاکـــەکانی
کۆمەڵ لەو ئاستە نزمە نزمتر بێ کە پێویستە هەبێ بۆ بەشدار کردنی لـە
رەنج دان بۆ بەرەو پێش بردنی ئابووری ، وە هەر کەسێك شتێکی لـە
گەنجینەی پەروەردگاردا بە دەست هێنا وە بە هەوڵو کۆشش خـۆی وا
لێکرد کە شایەنی ئەوە بێت کەڵكو سوودی لێ وەربگرێ ئەوە ئەو کەسە
بە خاوەن سەرپشتکەری ئەم شتە دادەنرێ ، وێنەی ئەمەش زەویو زاری
(مواتە) بێ خاوەنە کە مافی ملکایەتی هیچ کەسێکی تێدا نی‌یە ، جا ئەگەر
یەکێك ئەو زەوی‌یەی خستە ژێر رکێفی کارو باری خۆیەوەو کـــارو
بارەکانی بۆ چاك کردو بە شێوەیەکی سوود بەخشانەو بەرهەم ـ دارانە
بە کاری هێنا ئەوە نابێت لێی بستێندرێتەوەو لە ژێر دەستی دەربهێنرێت ،
بەم شێوەیە هەموو مافەکانی خاوەندارێتی بۆ زەوی بە پێی بۆ چـوونی
ئیسلام دەستی پێ کردووە • کاتێك کە ئادەمیزاد لە سەرەتادا ئـــەم
زەوی‌یەی ئاوەدان کردۆتەوە هـــەموو شتێك بە شێوەیەکی گشتی بۆ
بەرەی ئادەمیزار حەڵاڵ بووە ، کەواتە هەر کەسێك شتێکی بۆ خـــۆی
دابڕیو دەستی بە چاك کردنو رێکخستنی کارو بارەکانی کرد ، تاکو
وای لێهات کە شایەنی بە کار هێنانو کەڵك لێ وەرگرتن بێ ، ئەوە ئەو
کەسە دەبێتە خاوەنو سەر پەرشتی کەری شەرعی بۆ ئەم شتە ، مـانای
وایە : بە تەنها خۆی بۆی هەیە کـــە بە کاری بهێنێت ، وە هەروەها

دەتوانێت داوای کار تێدا کردنی بکات لە هەر کەسێك کە بەزێ بە کاری بهێنێو سوودی لێ وەربگرێ • ئا ئەمە ئەو بنچینە سرووشتی‌یەیە کە هەموو کارو بارەکانی ئابووری ئادەمیزادی لە سەر بنیات نراوە ، جا مادام وابێ جێگای خۆیەتی کە ئەو بنچینەیە بە دامەزراویو پارێزراویو ڕێزەوە بمێنێتەوە ، وە ئاینی ئیسلام ویستی وایە کە تاكو کۆمەڵ لە سەر ڕێگایەکی ڕاستو ڕەوا دابمەزرێنێتو لە سەر بنچینەی داد گەریەکی تەواو کۆیان بکاتەوە بە شێوەیەك : کە ماف‌و سەر پەشتی هەموو تاکێك بپارێزێتو زیان بە بەرژەوەندی کۆمەڵ نەگات ، وە لە ڕوانگەی ئیسلامەوە پەسەند نی‌یە ڕژێمێکی ڕامیاری یان ئابووری لە پێناو بەرژەوەندی کۆمەڵدا مافەکانی تاك هەڵ لوشێ ، وڕێگە نادات تۆزقاڵێك لە سەر بەستیە کەسایەتی‌یەکەی بروشێنرێت کە پێویستە هەبێت بۆ تەواو کردنی بەخشراوە سروشتیەکان •

وە ئەنجامی حەتمی گشتی کردنی هەل‌و مەرجەکانی زیانو هۆکانی بەرهەم هێنان ئەوەیە : کە هەموو تاکەکانی وڵات بە پەتی کۆمەڵ دەپێچرێنو ناگونجێ بەرهەمەڵدا بنو ڕزگار بنو بجوڵێن ، وە ئاشکرایە زۆر گرانە بەڵکو مەحاڵە کە لە ئاوا حاڵێكدا تاکەکان کەسایەتیان بمێنێو گەشە بکاتو بەرز بێتەوە •

وە شتێکی ڕوونو ئاشکراشە کە پارێزگاری کردن لە سەر کەسایەتی تاك بە ڕێژەیەکی زۆر گەورە پێویستی بە سەربەستی ئابووری هەیە ، هەر وەکو پێویستی بە سەربەستی ڕامیاریو کۆمەڵایەتی هەیە ، وە مادام نامانەوێ کە لێهاتووی ئادەمیزاد بنە بڕ بکەین پێویستە لە ناو کۆمەڵگای ئێمەدا دەرفەت بدرێت بە هەموو بەندەیەك لە بەندەکانی

پەروەردگار کە بە گوێرەی پێویستو ئارەزووی خۆی بژیو بۆ ژیانی خۆی بە دەست بهێنێو هێزی بیرو هۆشیو ڕەووشتی بە گوێرەی بیرو باوەڕو خواستەکانی خۆی بخـاتە کار • وە لە ڕاستیدا ئەو ڕزقو ڕۆزیە ڕەسمی‌یە دیاری کراوانەی کە کلیلی کردنەوەیان بـە دەستی بێگانەوەیە هیچ کاتێك دڵو دەروونی ئادەمیزاد پێی خۆش نیـەو نای خوازێت ، هەر چەندە بە ئەندازەیەکی زۆرو فراوانیش‌بێت ، چونـکە تێری‌و ورگ‌و قـەڵەوی جەستە ناگونجێ کـە ئـەو دوا خستن‌و پاشەکشەیەی ڕۆزی پەیدا کردن لـە چوونە پێش‌و چـاو قایمی بی گێڕنەوە ، هەر وەکو چۆن ئاینی ئیسلام ڕقی لەم جۆرە ڕژێمانەیە هەر بەم شێوەیەش بە چاوی ڕێزەوە سەیری ئەو ڕژێمە کۆمەڵایەتیە ناکات کە لە دائیرەکانی کۆمەڵایەتی‌و ئابووری‌دا جڵەو بۆ تاکەکانی کۆمەڵ شل دەکات‌و بەرهەڵدایان دەکات ، بۆ ئەوەی هـەر یەکە بە گوێرەی ویستو ئارەزووی خۆی بجوڵێتەوە بە شێوەیەك کە ببێت بە هـۆی شەڕو نەگبەتی بۆ کۆمەڵو بەرژەوەندی‌یەکانی ، وە ئەو ڕێـگە مـام ناوەندی‌یەی کە ئاینی ئیسلام هەڵی بژاردووە لە نێوان ئەو دوو لایەنە دژ بە یەکتردا ( لایەنی کەم تەرخەمی‌و زێدە ڕەوی ) ئەوەیە کـە لـە سەرەتادا تاك بە چەند کۆمەڵە سنورو ئەرکێك ببەسترێتەوە لـە پێناو پاراستنی بەرژەوەندی کۆمەڵدا ، پاشان لە چوار چێوەی ئەو سنورەدا سەربەستی تەواوی دەدرێتێ کـە تاك بە ئارەزووی خۆی کـارو باری ژیانی ببات بە ڕێوە ، وە لێرەدا دەرفەتی ئەوەمان نی‌یە کە بە دوورو درێژی باسی ئەو سنورو ئەرکانە بکەین ، بەڵام بە شێوەیەکی کورت‌و پوخت هەندێك لە لایەنە گرنگەکانیان باس دەکەین •

لە سەرەتادا بـە باسکردنی بژیوو داهاتەکانی ڕۆزی دەست پێ

دەکەین : ئاینی ئیسلام گرنگی‌یەکی زۆری بە هۆیەکـــانی وە دەست هێنانی بژیو داوە ، وە بایەی‌خێـــکی زۆری داوە بۆ جیا کردنەوەی حەڵاڵ‌و حەرام لە یەکتری ، بە شێوەیەك کە هیچ یاسایەك لە یاساکانی جیهـــان نەیان توانیوە بەم شێوەیە گرنـگی پێ بدەن ، بۆیە دەبینین فەرمانی دەرکردووە بە قەدەغە کردنی هەر کارێك بێت بە هـــۆی گەیاندنی زیان بە خەڵـکی دیکە ، وە یان بێت بە هۆی هێنانە کـایەی زیانێکی خوو ڕەوشتی ، یان ماددی بۆ سەرتاپای کۆمەڵ ، هەروەهـــا شەریعەتی ئیسلامی هەستاوە بە قەدەغە کردنی مەی کڕین‌و فرۆشتن‌و بەخشینی‌ی ئەو مەشروباتانەی کە دەبنە هۆی لابردنی هۆش‌و عـەقڵی ئادەمیزادو بڵاو بوونەوەی داوێن پیسی‌و ســـوورِ دان‌و گۆرانی ووتن‌و گاڵتە جاڕی‌و قومار کردن‌و یانسیب‌و سود خواردن‌و خیانەت کردن‌و فرۆشتنی شتومەکی نەدیتراو ( بیع الغرر ) وە هەروەها ئەو ڕیبـــازە بازرگانیانەی کە سوودو کەڵـکی مسۆگەر نی‌یە بۆ هەموو لایەنەکان ، وە هەروەها پاش قوول دان (احتکار)ی چەندەها شتی دیکە کە دەبنـە پەیدا کردنی زەرەرو زیان بۆ سەر کۆمەڵ . جا ئەگەر بێت‌و لـــەم ڕووەوە تەماشایی یاسای ئابووری ئیسلام بکەین‌و ، بە ووردی سەرنجی بدەین ناوەرۆکی دوورو درێژ بەدی دەکەین ، لەو ڕێگایانەی کە ئاینی ئیسلام لە کاتی بە دەست هێنانی بژیو قەدەغەی کردوون ، وە لە نێوان ئەو ڕێـگایانەشدا هەمان ئەو ڕێبازە ناشیرین‌و قەدەغە کراوانەت بـــە رچاو دەکەوێت کە خەڵکی ئیمڕۆ لە ڕژێمی سەرمایەداریدا بە کـاری دەهێنن ، وە دەیان باتە ڕێزی ئەو سەرمـایەدارە فێڵ بازانەی کـــە بەنجەیان بۆ درێژ دەکرێ وە ئاینی ئیسلام بە حوکمی یاسا دەرگـای ئەو ڕێـگایانە دادەخات ، وە ناچاریان دەکات کـە نابێت ماڵ‌و دارایی وەدەست بهێنن تەنها بەو ڕێـگایە نەبێت کـــە دەبێنە هۆی وەدەست

هێنانی خزمەتگوزاریەکی ڕاستەقینەیی بەکەڵك بۆ هەموو بەرەی ئادەمیزاد ، وە لە پاداشتی ئەمەدا کرێی خۆی بە دادو یەکسانیو ویژدانەوە وەردەگرێت ، وە ئەو ماڵو دارایی‌یانەی کە لە ڕێگای حەلاڵەوە وە دەست دەهێنرێن ئایینی ئیسلام دان بە مافی خاوەن دارێتی‌یان دادەنێت ، بەلاّم لەگەڵ ئەوەش‌دا ئەم دافانە دوو بارە لە ناو بازنەیەکدا بە چەند سنورو (زنجیرێك) بەستراونەوە ، وە بۆ ڕوون کردنەوەی ئەو لایەنەش پێویستە لە سەر مرۆف ئەو ماڵەی کە لە ڕێگەیەکی حەلاڵەوە وە دەستی دەخات سەرفی نەکات تەنها لە هەمان ڕێگاوە نەبێت ، وە بۆ ئەم مەبەستەش ئایینی ئیسلام چەند سنورێکی بۆ خەرج کردن ، دیاری کردوە بە جۆرێك کە مرۆف بتوانی لە چوار چێوەی ئەم سنورانەدا ژیانێکی بەرزو خۆش بەختانە بە سەر بیات ، بەلاّم لە هەمان کات‌دا ڕێگا نادات ماڵو دارایی‌یەکەی لە ڕێگەی نەفامیو بەد ڕەوشتی‌یەوە خەرج بکات ، وە یان لە ڕێگەی خۆ بە زل زانینو ڕابواردنەوە خەرجی بکات ، تاوەکو خۆی بە سەر تاکەکانی کۆمەڵەکەی‌دا فەرز بکات ، بە شێوەیەك کە خەڵکی دەورو بەری وەکو بابایەکی زۆردارو ستەمکار سەیری بکەن • ئەمانە چەند وێنەیەك بوون لە دەست بلاّوی لە ماڵو دارایی‌دا کە یاسای ئابووری ئیسلامی بە ئاشکرا و ڕاستەو خۆ قەدەغەی کردون ، چەند وێنەیەکی دیکەش هەن هەر چەندە ئایینی ئیسلام بە ئاشکرا قەدەغەی نەکردوون بەلاّم ویستو ئیرادەی داوەتە دەست دەوڵەتی ئیسلامی کە بە حوکمی یاسا دەستی خەڵکی بگرێتو ، قەدەغەیان بکات ، لەو جۆرە هەڵسو کەوتانەی کە دەبنە هۆی لە ناو چوونی ماڵو دارایی‌یان وە ئەو ماڵو دارایی‌یەی کە لە لای مرۆف زیاد دەبێت لە دوای ئەوەی کە لە ڕێگایەکی حەلاڵەوە خەرجی کرد ، لەم کاتەدا ئەو کەسە بە ئارەزووی خۆیەتی یان ئەوەتا کۆی

بکاتەوەو هەڵی بگرێ ، وەیان دەیخاتە کار لە چەند ڕوویەکی کارو کاسبیو بازرگانی ، بە نیازی زۆر بوونو لە سەریەك دانان • بەڵام لە هەردوو حاڵەتەکەدا ئایینی ئیسلام چەند سنوورو یاسایەکی بۆ دیاری کردووە • جا ئەگەر ویستی ماڵو دارایییەکەی کۆ بکاتەوە ئەوە لەو کاتەدا پێویستە کە لە هەموو ساڵێکدا زەکات دەربکات لەوەی کە زیاد دەبێت بە گوێرەی ئەو ئەندازەیەی کە بۆی دیاری کراوە ، بەڵام ئەگەر ویستی بیخاتە کار ئەوە ڕێگەی نادرێ تەنها بۆ وەدەست هێنانی ماڵێکی حەڵاڵو بازرگانیەکی ڕەوا نەبێت •

ئەمجا ئەو بازرگانیە یان ئەوەتا مرۆڤ بۆ خۆی پێیەوە هەڵبستێ ، یان ئەوەتا یەکێکی دیکە لە سوودو زیانیدا بەشداری لەگەڵدا بکات • ئەگەر هاتو ماڵو کەلو پەلەکەی لە سەر بنچینەی هاوبەش تەسلیم کرد، جا ئەو ماڵە پارە بێت یان زەوی بێت یان کەلو پەل بێت •

جا ئەگەر هاتو مرۆڤ لە دوای ماوەیەك لە چوار چێوەی ئەو سنوورو یاسایانەدا بوو بە خاوەن ماڵێکی زۆر ئەوە لە ڕوانگەی ئیسلامەوە هیچی لە سەر نیە بەڵکو ئەوە نیعمەتو بەخششێکە لە بەخشندەکانی خوا بە سەر بەندەی خۆیدا ڕژاندووە • بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ئایینی ئیسلام دوو مەرجی دیاری کردووە :

١ ـ هەموو ساڵێك زەکات لە ماڵو دارایییەکەی دەر بکات ، وە ئەوەی کە خوا لە سەری پێویست کردووە لە دەیەکی بەرو بوومی کشتو کاڵ لێی دەر بکات •

٢ ـ ئەو کەسانەی کە هاوبەشی بازرگانیو پیشە سازیو کشتو

کاڵیان لەگەڵدا دەکاو زەوی‌و زاریان بەکرێ دەداتێ پێویستە لە سەری کە بە جوانترین شێوە هەڵس‌و کەوتیان لەگەڵدا بکات ، لە گەڵیان ڕێك بکەوێ ، وە بە ویژدانەوە مامەڵەیان لەگەڵدا بکات •

خۆ ئەگەر هات‌و بەدادگەری‌و ویژدان لەگەڵیاندا نە جووڵایەوە ئەوە لەم کاتە دەوڵەتی ئیسلامی بە زۆر ناچاری دەکات کە بە ڕێك‌و پێکی هەڵس‌و کەوتیان لەگەڵدا بکات • ئنجا ئەو ماڵ‌و دارایی‌یەی کە لە چواو چێوەی ئەو سنورانەدا کۆ کراوەتەوەو بە سەر یەك نراوە ئاینی ئیسلام ڕێگە نادات تاکو ماوەیەکی زۆر دورو درێژ بە داکراوی بمێنیتەوە ، بەڵکو بە حوکمی یاسای میرات فەرمان دەدات بە دا بەشکردن‌و بڵاو کردنەوەی پێر لە دوای پێر ، وە ڕوو بە ڕوو بوونی یاسای ئیسلامی لەو مەسەلەیەدا جیاوازی‌یەکی زۆری هەیە لەگەڵ هەموو یاساکانی دیکەی جیهان ، بەڵام لە ڕوانگەی یاساکانی دیکەی جیهان ئەو ماڵ‌و دارایی‌یەی کە بە جارێك کۆ بۆتەوە ڕێگەی دراوە کە بە کۆکراوەیی بمێنێتەوە ، چین لە دوای چین بە پێچەوانەی ئەمەوە ئاینی ئیسلام بە یاسایەکی کۆکەرەوە هات‌و فەرمانی دا کە ئەو ماڵەی کەسێك لە ماوەی ژیانی‌دا کۆی کردۆتەوە لە دوای مردنی لە نێوان خزم‌و کەس‌و کارەکانیدا دەست بە جێ دابەش بکرێ ، ئەگەر هات‌و هیچ کەسێکی نزیکی نەبوو لە هۆزەکەی خۆی کە میراتی لێ بگرێ ، ئەوە لەم کاتەدا دەدرێت بەوانەی کە لە دوای چینی یەکەم میراتی لێ دەگرن ، وە هەروەها دەدرێت بەوانەی کە پەیوەندی خزمایەتی‌یان لە نێوانیاندا هەیە بە گوێرەی بەش‌و بەرکەوتنیان ، بەڵام ئەگەر هات‌و هیچ کەسێك نەبوو میراتی لێ بگرێت لەوانەی کە پەیوەندی پشتایەتی پێ‌یانەوە هەیە ، وەیان لێ‌یەوە نزیکن ، ئەوە لەم کاتەدا ئەو ماڵە

بەجێماوە دەدرێتە گەنجینەی مسوڵمانان ، وە یان دەدرێتە کۆمەڵگەی ئیسلامی بە شێوەیەکی گشتی ، وە ئەم یاسایە ( قانون الوراثة ) ڕێگە نادات بە هیچ شتێك لە ماڵو دارایی کۆ کراوە ، وە یان بە هیچ ڕژێمێك لە ڕژێمە دەرەبەگی یەکان کە بە بەردەوامی بمێنێتەوە ، بەڵکو لە ڕاستیدا فەرمان دەکات بە لە ناو بردنی هەموو خراپەیەك کە لە ئەنجامی کۆکردنەوەی ماڵدا پەیدا دەبێت لەگەڵ بوونی هەموو ئەو مەرجو سنورانە کە لە پێشەوە باسمان کردن •



# یاسای گیانی الروحی

یاسای ئیسلام دەربارەی پەیوەندی نێــوان بەندەو خوا چیۍیە ؟ وە پەیوەندی نێوان ئیسلامو هەموو ڕژێمەکانی دیکە چیۍیە لە ژیانی ئــەم جیهانەدا ؟ ئەمە مەسەلەیەکە پێویستە لە سەر ئێمە بۆ تێگەیشتنو هەست کردن بە واتاکەی ئاگادارییەکی تەواومان هەبێت بە جیاوازی لە نێوان ئەو پەیوەندییەی کە لە نێوان بەندەو پەروەردگاریدا هەیە لە ئیسلامدا ، وە لە نێوان بۆ چوونی پەیوەندی لەگەڵ هەموو ڕژێمە فەلسەفەییەکانی دیــکەدا ، جا ئەگەر مرۆڤ لەم جیاوازییەدا زۆر وورد نەبێتو شارەزا نەبێتو بشیەوێت لەم بارە بکۆڵێتەوە ئەوە چەندین خەیاڵاتو بۆچوون لە زۆربەی کاتەکانیدا بە مێشکیدا دێت (مەبەستی بێت یان مەبەستی نەبێت) کە لە ڕۆژگاری ئێمەدا بە هەڵسو کەوتی گیانی (روحی)ناو دەبرێت ، جا لێرەدا کارەکەی لێ تێکەڵ دەبێتو لە سەری قورس دەوەستێت کــە بزانێ ئەو یاسا نامۆیە گیانییە کە هێزو دەسەڵاتی لە چوار چێوەی گیانی بەردو چوار چێوەی ماددەو لاشە تێدەپەڕێو خۆی دەخزێنێتە ناو کارو باریەوە ، وە لە هەمان کاتدا دەیەوێت کە دەست بە سەر ماددەدا بگرێتو خۆی لە هەڵسو کەوتو کارو بارەکانیدا هەڵسوڕێنێ وە ئەو بیرەی کە تاکو ئێستاش لە گۆڕەپانەکانی فەلسەفەو ئاینەکانی دیکەدا زاڵە ئەوەیە کە گیانو لاشە ( الروح والجسد ) دوو شتی دژ بە یەکنو دانویان لەگــەڵ

یەکتریدا ناکوڵێت ، هەر یەکەیان لە ئاشێك لێ دەکەن ، ئەوەی کە یەکێکیان دەیخوازێتو پێویستی پێی هەیە ، جیایە لەگەڵ ئەوەی دیکەیان کە بۆی هەوڵ دەدات ، لە بەر ئەوەی شتێکی ئەستەمە کە شان بە شانی یەکتری بەرز بکرێتەوەو گەشەیان پێ بدرێت ، وە جەستەو جیهانی مادده بەندیخانەی گیانن ، وە پەیوەندی‌یەکانی جیهانو ڕۆچوون لە ناو تامو چێژو ئارەزووەکانیدا بریتیە لە چەند کۆتو زنجیرێك کە گیانی ئادەمیزادی پێ کۆت کراوە ، کارو بارەکانی جیهانیو ڕێگاکانی کارو بژیوی لە جیهاندا بریتی‌یە لە چەند کەندو کۆسپێك کە ڕوو بە ڕووی گیان دەوەستنو دەبنە پەرچ لە ڕێگای بەرز بوونەوەی گیان بۆ بارو دۆخی بەرزو پێشکەوتن !!.

لە ئەنجامی ئەم بیرەدا ڕێبازەکانی گیانیو ماددی لێك دابڕاونو ڕێبازو بەرنامەکانیان لێکی جیا کردنەوە ، جا ئەوانەی کە ڕێبازی ماددەیان هەڵبژاردو کردیان بە پێشەنگی ژیانیان لە کارو باری جیهاندا ، هەر لە یەکەم هەنگاودا بێ ئومێد بوون لەوەی کە لەگەڵ ڕێبازی گیانی (روحی) بە ڕێگادا بڕۆنو ، لەم قۆناغەدا هاوسێ‌یەتی لەگەڵدا بکەن !!.

وە لە بەندایەتی مادده پەرستیدا تاکو بناکوێیان ڕۆچوونو ، هەموو کۆمەڵگاو شارستانیەتو لایەنی ڕامیاریو گوزەرانو هەموو یاساکانی دیکەی ژیانی جیهانی‌یان کە لە لایەنی گیانی (روحی) داڕنیوەو لە مانا پڕ پێزو فەرەکەی ڕوتیان کردەوە ، تاوەکو هەموو سەرزەوی پڕ بوو لە جەورو ستەمو روژمن‌کاری . ئەوانەی کە لایەنی گیانیان هەڵبژاردو بەدوایی‌دا گەڕان بۆ بەرز کردنەوەی لایەنی گیانیان ، چەند ڕێبازو بەرنامەیەکیان هەڵبژارد کە لە کارو باری جیهانیدا بێ لایەنی کردن . لە بەر ئەوەی بۆچوونی ئەوان بۆ بەرز کردنەوەی گیانی شتێکی ئەستەم

بوو که ڕێگایەك بگرنە بەر لە بەینی ژیانی جیهانو کارو بارە سەرنج ڕاکێشەرە جیا جیاکاندا بێت ، وە ئەوان (ڕوحانی‌یەکان) لە پێناو بەرز کردنەوەی گیانو ڕاپەڕاندنی کارو باریان هیچ ڕێگایەکیان نەدیتەوە جگە لە پشت گوێ خستنی لاشەو بە سوك سەیر کردن نەبێ •!! :
جا لە بەر ئەوەی دەیانبینی کە چەندەها جۆرە وەرزشی لاشەیی قورسیان دادەهێنا بۆ لە ناو بردنی هەواو ئارەزووی مرۆڤ ، وە بە هۆی ئەم وەرزشەوە لاشە وەکو جەستەیەکی مردوی بێ هەستو جوڵاوی لێ دەهات •

ئینجا وایان بە باش زانی کە شیوو دۆڵی شاخەکانو کونو کەلەبەری بیابانەکانو ئەشکەوتو کونە شاخەکان گونجاو ترین شوێنن بۆ پەروەردە کردنی گیان ! لە ئەنجامدا چوونە ناو ئەشکەوتو کونە شاخەکان ، بۆ ئەوەی خۆیان لە هاتو هاوارو دەنگە دەنگی ژیانی شارستانیەتی دەرباز بکەن ! : وایان بە باش زانی بۆ گیانیان کە خۆیان لە هەموو شتێك دا ببڕنو وە لە هەموو شتێکدا بۆ خوا لێ ببڕێن ببڕیان لێ دەکردەوە لە مانی خۆیان وورد دەبوونەوە هیچ ڕێگایەکی باشتریان نەدەدۆزیەوە بۆ گەشە پێدانو بەرز کردنەوەی گیان ، جگە لەوە کە پشت لە دونیا بکەنو بە تەواوی خۆیان لە پەیوەندی‌یەکانی جیهاندا دابڕنو هەموو پەیوەندی‌و ئاشنایەتیەك بپچڕن کە دەبێتە هۆی بەستنەوەیان بە جیهانی مادی‌یەوە • !

وە بۆ چوونی ئیسلام لەم بارەوە جیاوازە لەگەڵ بۆ چوونی ڕژێمە ئاینی‌و فەلسەفەیی‌یەکانی دیکەی جیهان • ئاینی ئیسلام دەفەرموێت گیانی ئادەمیزاد جێ‌نشینی پەروەردگارە لە سەر زەوی‌و کۆمەڵێك لە مافی هەڵس‌و کەوت کردنو جێ بەجێ کردنی ئەرکی سەرشانو هەڵسوڕانی

کارو باری پێشکەوتن‌و شارستانی‌یەتی خستۆتە ژێر دەست وە بۆ ئەنجام دانی ئەم ئەرکانەش خوای گەورە باشترین لاشەی پێ بەخشیوە لە هێزو توانا‌و شێوەدا ، وە لە ڕاستی‌دا گیانی ئادەمیزاد ئەو لاشەیەی پێ نەبەخشراوە تەنها بۆ ئەوە نەبێ کە بە کاری بهێنێ بۆ ئەو شتانەی خوا پێ‌ی بەخشیوەو ڕێگەی هەڵسوڕاندنی داوە ، وە بۆ ئەوەی بە هۆی ئەم لاشەوە بتوانێت ئەو ئەرکانە جێ بەجێ بکات کە لە سەری پێویست کراوە •

کەواتە دەرکەوت کە لاشە بەندیخانەی گیان نی‌یە ، بەڵکو کارگەیەکە بۆ گیان • ئەگەر ئەو گیانە هەر شتێکی لە نەشونماو بەرز بوونەوەی بۆ دیاری کرابێ ، کاتێك دەتوانێ بەمە بگات ئەگەر ئەم بەخشش‌و ئامادە کراوە سرووشتیانەی کە بە کارگەی جەستە بەخشراوە بتوانی بە کاریان بهێنێت • وە نەبێت ئەم جیهانە جێگای سزاو ئەشکەنجەو ئازاری دەروون بێت‌و گیانی ئادەمیزادیش لە ناو قوڕو زەلکاوی ئەم سزاو ئازارەدا بتلێتەوە بە هۆیەك لە هۆیەکانی ، بەڵکو لە ڕاستی‌دا ئەم جیهانە گۆڕەپانی کار کردن‌و قۆناغی هەوڵ‌و کۆشش‌و ڕەنج دانەو خوای پەروەردگاریش گیانی بە ئادەمیزاد بەخشیوە بۆ ئەوەی بە فەرمانەکانی سەر شانی هەستێت لە بەر ئەوە خوای گەورە ئازادی داوەتە دەست گیان ، بۆ ئەوەی هەڵس‌و کەوت‌و ئاڵ‌و گۆڕی لە زۆربەی ئەو شتانەدا بکات کە خوای گەورە لە سەر ئەم زەوی‌یەدا پێ‌ی بەخشیوە • هەروەها لەگەڵ ئەم شتانەدا کۆمەڵێکی زۆر لە ئادەمیزادی دروست کردووە بۆ ئەوەی بە ئەرك‌و فەرمانی ئەم جێ‌نشینە هەستن‌و کارو بارەکانی ببەن بەڕێوە ، هەروەها چەندین جۆر لە شارستانیەت‌و کۆمەڵایەتی‌و ئابووری‌و ڕامیاری بۆ دەرخستن‌و هێناویەتە جیهانی بوونەوە ، ئەوەش بە هۆی

ئەوەوەیە کە سرووشتی ئادەمیزاد دەیخوازێتو پێویستی‌یەکی زۆری پێ هەیە • جا لە بەر ئەوە جێگای خۆی نیە کە مرۆڤ بستێ خۆی لەم قۆناغە لە لایەنێك لە لایەنەکانیدا دوا بخات •

بەڵکو دەبێ لێهاتوو بێتو بەخششە سرووشتی‌یەکانی بە کار کردنو هەوڵو کۆشش کردن لە چوار چێوەی ئەم مەودایەی کە بۆی دیاری کراوە بە کاری بهێنێت ، وە وا بزانێ کە ئەم جیهانە شوێنی تاقی کردنەوەی مرۆڤە ، وە هەموو لایەنێك لە لایەنەکانی ئەم ژیانە وە هەموو لقێك لە لقەکانی پرسیارێکە لە پرسیارەکانی ئەم تاقی کردنەوەیە ، وە ماڵو گەڕەكو بازاڕو بەڕێوەبەرایەتی‌و کارگەو دەزگاو قوتابخانەو دادگاو پۆلیس خانەو سەر بازگەو کۆڕی جێگرانو کۆنگرە ئاشتی‌و گۆڕەپانی جەنگ ، ئا ئەمانە هەموویان چەند پرسیارێکن جیا جیان بۆ تاقی کردنەوەی بەندە لە چەندین هونەرو زانیاری‌یە جۆراو جۆرەکانن • جا دەبێت دوا ڕۆژو سەرەنجامی ئەو کەسە بە چی بگات ئەگەر گرنگی‌یەك بەم پرسیارانە نەدات ؟ یان هەموویان واز لێ بهێنێت بە بێ ئەوەی وەڵامی هیچ کامیان بداتەوە ؟ ئایا بەختو چارە نووسی ئەو کەسە لە پلەی (سفر) زیاتر هەیە ؟ بە ڕاستی چاوەڕوان کردنی دەرچوونو بەرز بوونەوە نایەتە دی مەگەر کاتێك کە مرۆڤ گرنگی‌یەکی زۆری بەم تاقی کردنەوەیەدا بێتو بە هەموو هێزوو توانایەکیەوە خۆی بۆ وەڵام دانەوەی ئەم پرسیارانە ئامادە کردبێت کە ڕوو بە ڕووی دێن ، هەروەها ئایینی ئیسلام بە گۆشە نشینی‌و ڕەبەنی‌و دوورە پەرێزی ڕازی نیە ، چونکە هیچ ڕێگایەك لە دەرەوەی ژینگەی شارستانیەتی بەدی ناکات بۆ بەرز بوونەوەی مرۆڤی خوا ناس ، بەڵکو بەرز بوونەوەی ئادەمیزادی خواناس لە ناو کۆمەڵو ژینگەکەی‌را دەبێت ، وە دوور کەوتنەوە لە ناو کۆمەڵو ژیان بە سەر

بردن له دەرەوەی شارستانیەت‌و لێوارەکانی ، نابێتە هۆی بەرز بوونەوەو نەش ونمای گەشانەوەو خۆش بەختی‌و ڕزگار بوونی گیان • بەڵکو لە ڕوانگەی ئیسلامەوە بەرزبوونەوەی گیان‌و ئاسودە بوونی لە ناو جەرگەی کۆمەڵدا دەبێت • جا لە بەر ئەوە پێویستە لە سەر ئێمە کە تەماشا بکەین‌و بە وردی سەرنج بدەین لەو تیۆرانەی کە بۆ بەرز بوونەوەو نەزم بوونەوەی گیان دیاری کراون • ئەمەش پرسیارێکەو وەڵامەکەی لە مانای جێ‌نشین (خلافة)دا دەست دەکەوێ کە تۆزێك لەمەو پێش باسمان کرد ، وە ئادەمیزاد بە بێ ئەوەی کە جێ‌نشینی خوای پەروەردگارە لە سەر ئەم زەوی‌یەدا بەر پرسیارە بەرامبەر بە خوا لە وەی کە دەیکاو بە دەستی دەهێنێ ، لە قۆناغی ژیانیدا • وە ئەرك‌و پیشەی سەر شانی تەنها ئەوەیە کە ئەو ماف‌و دەسەڵات‌و هۆیانە بە کار بهێنێت بە گوێرەی ڕەزامەندی پەروەردگارو ڕێ نموونی‌و ویستی ئەو ، وە هەموو بەخشش‌و هێزو توانایەکی کە خوا پێ‌ی بەخشیوە بە گوێرەی تواناو دەسەڵاتی خۆی‌و ڕەزامەندی خوا بە کاریان بهێنێت ، لە هەموو جۆرە پەیوەندی‌و ئاشنایەتی‌یەك کە لەگەڵ خەڵکی دەیبەستێت‌و مەبەستی سەرەکی تەنها ڕەزامەندی پەروەردگار بێت •

وە پوختەی قسان ئەوەیە کە ئینسان هەموو هەوڵ‌و کۆششێکی مەبەستی چاککردنی زەوی‌و ڕێك خستنی یاسای ژیانی سەر زەوی بێت • وە بەو ئەندازەیەی کە خوا دەیەوێت سەر زەوی پێ بڕازێنێتەوەو چاکەو چاکە کاری لە سەر دابمەزرێنێ • وە تاوەکو مرۆڤ زیاتر بەو خزمەت گوزاری‌و هەست کردن بە هەڵسوڕاندنی کارو باری ژیان‌و زانینی ئەرکی سەر شان گوێ ڕایەڵی‌و مل کەچ کردن بۆ فەرمانەکانی خواو ڕەزامەندی ئەو هەستێت زیاتر لە خوا نزیك دەبێتەوەو بە

ڕەحمەت‌و بەزەیی‌یەکانی شاد دەبێت •

ئا ئەم نزیك بوونەوەیە بۆ لای خوا بەرزبوونەوەی گیانی تێــدا بەدی دەکرێت ، بەڵام بە پێچەوانەوە ، تاوەکو ئادەمیزاد زیاتر تەمــەڵ‌و دوا کەوت‌و بێت لە کارو تێکۆشاندا ، وە بێ ئاگا بێت لە هەڵسووڕاندنی کارو باری ژیان ، وە یان زیاتر سەر پێچی‌کەرو یاخی بێت ئــەوا زیاتر لە خوا دوور دەکەوێتەوە • جا ئەو دوور کەوتنەوەیە لە خوا دەبێتە هۆی نزم بوونەوەو دابەزینی گیـــان ، بــە پێی بۆ چوونی ئایینی بەرزی ئیسلام •

وە ئەوەی لەم درێژە پێدانەدا دەردەکەوێت ئەوەیە کــــە قۆناغی کارو تێکۆشانی پیاوی ئایینی‌و پیاوی دنیایی لە ڕوانــگەی ئیسلامەوە هیچ جیاوازی‌یەکیان نیە بەڵــکو هەردووکیان لە یەك گۆڕەیاندا هــاوبەشی دەکەن‌و لە یەك کارواندا پێش بڕکێ دەکەن ، بەڵــکو بابای خوا پەرست خوا پەرستی خۆی لە نێو بازنەی کارو باری دنیادا دەبینێ ، وە شــوێنی گەشە کردن‌و بەرز بوونەوەی ڕووح نەك هەر لە دەرەوەی ژیانی دنیادا نی‌یە بەڵــکو ئەوەی بابای خوا پەرست دەیەوێ‌و بۆی تێدەکۆشێ بابای دنیایی هەر ناشی گاتێ ، ( واتە بابای خوا ناس لە هی دنیاییش ئـــاوات بەرزترە سەباوەت بە ژیان • پیاوی ئایینی هەڵدەستێ بـــە هەڵسوڕاندنی هەموو کارو بارە جیا جیاکانی ژیانی دونیاو قۆناغەکانی کە دێنە ڕێی ، هــەر لە تێکەڵاوی ناو مــاڵ تا دەگاتە لیژنە جیهانی‌یە دەوڵەتی‌یەکان هەر وەکو چۆن پیاوی دنیایی پێی هەڵدەستێت بەڵــکو لە هەمان کـــاتدا پیاوی ئایینی پێشی دەکەوێتەوەو بە جوانترین شێوە ئەنجامی دەدات ، وە هیچ هەنــگاوێك نانێت لە کارەکەی‌دا بە بێ ئەوەی بزانێت بەرپرسیــارە

بەرامبەر پەروەردگاری‌و هیچ مەبەست‌و نیازێکی لە ئەنجام دانی ئەم کارە لە دڵدا نی‌یە تەنها ڕەزامەندی پەروەردگاری نەبێت ، بەڵام پیاوی دنیا تەنها خۆی دەبینێت ، بە پێچەوانەی پیاوی ئایینی بە سەربەستی‌و بەرەڵایی بێ هەست کردن بە بەرپرسیاری لە بەرامبەر کەسدا ، وە هیچ کارێك ئەنجام نادا تەنها بە گوێرەی هەواو ئارەزووی نەفسی خۆی نەبێت ، وە هیچ گوێ نادات بەو فەرمانەی کە بە سەریدا دادراوە یان لێی قەدەغە کراوە : ئێستاش دەمەوێ پێتان ڕابگەیەنم‌و بۆتان ڕوون بکەمەوە، کە چۆن ئایینی ئیسلام نەخشەی ڕێبازی بەرز بوونەوەی ئینسانی ڕوحانیمان لە ژیانی جیهانی ماددی‌دا بۆ دەکێشێ‌و چۆن دەرگای نەش‌و نمای بۆ ئاوەڵا دەکاتەوە • جا یەکەمین قۆناغ : لە قۆناغی ئەم ڕێبازە بڕوای ڕاستەقینەیە بە خوا ، بە شێوەیەك کە بچێتە ناو دڵ دەرونی مرۆڤ‌و ڕەگ‌و ڕیشەی تێدا داکوتێت ، وە بیرو بڕوای وابێت کە هیچ پەرستراوێك وە هیچ پاشایەك‌و هیچ دادگەرێك نی‌یە لە سەر زەوی بێجگە لە خوای پەروەردگار ، وە لە ژیانی ڕۆژانەو ئەو هەوڵ‌و تەقەلایەی کە دەیدات نابێت هیچ مەبەستێکی هەبێت بێجگە لە ڕازی کردنی خوا ، وە هیچ بەرنامەو یاسایەك لە ژیانی ڕۆژانەدا پەیڕەوی نەکات تەنها ئەوە نەبێت کە خوا بۆی دیاری کردووەو فەرمانی پێ داوە •

جا ئەم بیرو باوەڕە تاکو زیاتر بچێتە مێشکی مرۆڤەوە زیاتر خۆی دادەکوتێت‌و ڕەنگ دانەوەی ژیری ئیسلامی زیاتر دەبێت‌و توانای بەرز بوونەوەی گیانی بەرز تر دەبێتەوە بۆ بەرز ترین پلە •

قۆناغی دووەم : لە قۆناغەکانی ئەم ڕێبازە بریتی‌یە لە گوێ ڕایەڵی (الطاعة) مەبەست لە گوێ ڕایەڵی ئەوەیە کە مرۆڤ خۆی دوور

بگرێت لە سەر بەخۆیی‌و ئازاری کەسایەتی خۆی لـە هـەموو کردارو گوفتاری ڕۆژانەی‌دا ، وە لە هەموو کردارەکانیدا مەبەستی گوێ ڕایەڵی کردنی ئەو خوایە بێت کە بڕوای پێ‌ی هەیەو دڵنیایە لەوەی کە بێجگە لەو هیچ خوایەکی دی نی‌یە ، ئا ئەم گوێ ڕایەڵی‌یە لە زاراوەی قورئاندا بـە ئیسلام ناو دەبرێت •

قۆناغی سێ‌یەم : لە قۆناغەکانی ئەم ڕێبازە پارێزگاری (التقوی)یە کە دەتوانین بڵێین مەبەست لە (تقوی) ئاگادار بوون‌و شارەزا بوونە لە ئەرکی سەرشانو هەست کردنە بە هەڵسوڕاندنی کارو بار ، وە مانای لـە خـوا ترسانیش ئەوەیە کە بەندە هیچ کارێك لـە هیچ لایەنێك لە لایەنەکانی ژیانی‌دا ئەنجام نەدا مەگەر لە کاتێك‌دا کە دڵنیاو بێ گومان بێت لـە وەی کە لە هەموو بیرو کردارو گوفتارەکانی‌دا لە بەردەم خوادا بەر پرسیارە ، وە خۆی دوور بخاتەوە لە هەموو ئەو شتانەی کە خوا قەدەغەی کردوون، وە قۆڵی لێ هەڵماڵێ بۆ هەستان بە ئەنجام دانی ئەو کارو فەرمانانەی کـە خوا فەرمانی پێ کردوون ، وە لە ماوەی بە سەر بردنی ژیانی ڕۆژانەی‌دا ئاگاداری‌یەکی تەواوی هەبێت بە جیا کردنەوەی حەڵاڵ‌و حەرام‌و ڕاست‌و هەڵەو چاکەو خراپە، ئەمەش بە هەست کردنێـکی تەواو‌و ئارەزوویەکی دەرونی تەواوە ئەنجام دەدرێ •

قۆناغی چوارەم : لە قۆناغەکانی ئـەم ڕێبازە چاکـە کردنە ( الاحسان ) مەبەست لـە چاکـە ئەوەیە ویست‌و ئارەزووی بەندە لەگـەڵ ویست‌و ئارەزووی خـوادا یـەك بگرنەوە بە شێوەیەك کـارێك ئەنجـرام نەدات تەنهـا ئەوەی نەبێ کـە خوا پێ‌ی خۆشە ، وە لە هیچ کارێکیش دوور نەکەوێتەوە تەنیا ئەو کارانە نەبێت کـە خـوا

قەدەغەی کردووە ، وە تەنیا ئەوەندە بەس نیە بۆ ئینسان کـە ئارەزووی خۆی قەدەغە بکاتو دووری بخاتەوە لـــەو خـــراپە کـــاریو کـــارە ناڕەوایییانەی کە خوای گەورە دەیەوێت سەر زەوی خـــۆی لێیان پاك بـکاتەوەو بەس ، بەڵـکو پێویستە لـە هەوڵو کۆشش کەمتەرخەمی نەکاتو هەرچی لە وزەو توانایا هەیە بیخاتە کار بۆ بنەبڕ کردنو لـە مێخ هەڵـکەندنی ڕەگو ڕیشەی درەختی خراپو خراپە کاری •

وە هەروەهـــا نابێت درێخی بـکات لە پێناو ڕازاندنەوەی ژیانی ڕۆژانەی بەو ئاکارو خووڕەوشتە بەرزانەی کـــە خوای پەروەردگار دەیەوێت سەر زەوی پێ بڕازێنێتەوەو هیچی تر ، بەڵـکو پێویستە هەرچی لە توانادایە بیبەخشێت لە پێناو بلاو کردنەوەی فەڕو بەرکەتی خوای لـــە سەر زەوی ، هیچ کاتێك نە لە خۆیدا وە نە لەماڵو داراییەکەیدا ڕژدێ چاو چنۆکی نەنوێنێت ، وە هەر کاتێك بۆی ڕەخسا کە بـکات بـەو پلە بەرزە ئەوە مانای وایە کە لە پەروەردگار نزیك بۆتەوە ، کەواتە ئیحسان بەرز ترین پلەیە کە ئادەمیزاد چـــاوی تێ دەبڕێت بۆ بەرز کردنەوەی لایەنی گیانی •

ئا ئەمەیە ڕێبازی بەرز کردنەوەو گەشە پێدانی لایەنی گیانی لـــە ئاینی پیرۆزی ئیسلامدا ، وە ئەو قۆناغانەی کە لە مەو پێش باسمان کردن تایبەت نییە بە چەند تاکێكو بە چەند کۆمەڵێکی تایبەتییەوە ، بەڵـکو لە مانە تێ دەپەڕێت بۆ ناو چەندین کۆمەڵـگاو چەندین گەلو نەتەوە ، جـا مادام وابێت هەموو گەلێك دەتوانێت کە قۆناغەکانی بڕوا بوون بە خواو ، گوێ ڕایەڵی فەرمانەکانیو لـــە خوا ترسانو گەیشتن بەو پەڕی پلەی چاکەو چاکە خوازی ببڕێت • وە هەروەها هەموو ولاتێك لە ولاتەکـانی

جیهان بە یاسا فراوانەکانیانەوە دەتوانن کە بە دڵنیایی‌و ئاشتی خوازانە ژیان ببەنە سەرو بگەن بەو پەڕی پلەی چاکەو چاکە کردن بە هۆی لەسە خوا ترسانیانەوە ، وە لە ڕاستیدا هیچ کاتێك ئاینی پیرۆزی ئیسلام ئاوات‌و مەبەستەکانی نایەتە دی تەنها کاتێك نەبێت کە سەرتاپای گەلانی جیهان لە سەر ئەم ڕێبازە بڕۆن‌و لە سەر زەوی خوادا وڵاتێکی ڕازاوە بە لە خوا ترسان‌و چاکە کردن پێك نەهێنن •

کەواتە ئێستا جێگای خۆیەتی کەوا ئاگادار بین‌و چاوێك بخشێنین بەو یاسا پەروەردگاریانەی کە ئاینی پیرۆزی ئیسلام هەڵی بژاردووەو ، نەخشەی بۆ کێشاوەو بنچینەکانی بۆ بنیات ناوە بۆ پێگەیاندنی ئەندامەکانی کۆمەڵ‌و مەشق کردنیان لە سەر ئەم شێوازە تایبەتی‌یە بۆ بەرز بوونەوەی لایەنی گیانی ، جا ئەم یاسایەش لە سەر چوار بنچینە دامەزراوە :

بنچینەی یەکەم نوێژە : نوێژ لە هەموو شەوو ڕۆژێکدا بە لانی کەم پێنج جاران لە ناو مێشکی مرۆڤدا یاد کردنەوەی خوای تاك‌و تەنیا تازە دەکاتەوەو لە سزاو دەسەڵاتی توندو تیژی خوا دەیترسێنێت ، وە هیواو ئومێدی سۆزو بەزەیی‌و نزیك بوونەوەی خوای لە دڵدا دەڕوێنێت ، وە جار لە دوای جار یاساکانی خوای دەخاتە بەردەم‌و لە سەر گوێ ڕایەڵی‌و مل کەچ کردنی بۆ فەرمانەکانی خوا ڕای دێنێت ، ئەمجا ئەم نوێژەش وە نەبێ تەنیا بە شێوەیەکی تاکی لە سەر ئەندامەکان پێویست کرابێت ، بەڵکو خوای پەروەردگار لە سەری پێویست کردوون کە نوێژەکانیان بە کۆمەڵ بکەن •

بنچینەی دووەم ڕۆژووە : ڕۆژوو مسوڵمانان بە تاك‌و کۆمەڵەوە لە سەر خۆ ڕاگرتن‌و لە خوا ترسان ڕادێنێت ، بۆیە خوای گەورە پێویستی

کردووه له سەر هەموو مسوڵمانان کــه لــه هەموو ساڵێکدا مانگێك بەڕۆژوو بن •

بنچینەی سێیەم ماڵ پاك کردنەوە (الزکاة)ە :

زەکات خۆشەویستیو برایەتیو دڵ دانەوە لە ناو دڵی مسوڵماناندا دەڕوێنێتو ، لە سەر ماڵ بەخشینو گیانی یارمەتی لە نێوانیاندا ڕادێنێت ، بەڵام ئەوەی جێگەی داخە ئەوەیە کە زۆربەی خەڵکی لەم چەرخــەدا مانای زەکات بە سەرانە (الضریبة) لێك دەدەنەوە ، بەڵام لە ڕاستیدا ئــەم مانا بەرزەی لە زەکاتدا هەیەو ، خوا بۆی دیاری کردووە هیچ پەیوەندیو ئاشنایەتییەکی نییە لەگەڵ ئەو مانا ماددییەی کە بۆ سەرانە دانراوە ، چونکە ووشەی زەکات لە زمانی عەرەبیدا بە مانای بەرز بوونەوەو نەشو نماو گەشانەوەو پاكو خاوێنی هاتووە ، وە ئەوەی کە ئایینی ئیسلام لــە وشەی زەکاتدا بە کاری دێنێت ئەوەیە کە لە مێشکی مرۆڤدا بیچەسپێنێ کە ئینسان هیچ نەفەقەیەکی ماددی بچووك یان گەورە نا بەخشێت لە پێناو یارمەتی دانی برا مسوڵمانەکەیو ڕەزامەندی خوا کە نەبێتە هۆی جێگیر بوونو توانای نەشو نمای سیفەتە مەعنەویەکانیو پاك کردنەوەی خــوو ڕەوشتە گشتییەکانی •

بنچینەی چوارەم سەردانی ماڵی خوا (الحج) :

حەج کردن وا لە بڕوا داران دەکات لە هەموو ناوچە جیا جیاکــانی سەر زەوی ببن بە کۆمەڵێکی یەك گرتووی جیهانی وا کە بنچینەکەی لە خوا بە یەك ناسینو بەندایەتی کردن بۆ خوای تاكو تەنیا دامەزرێت ، کــە بەمەش گیانی برایەتییەکی فراوانی جیهانی لە نێوانیان دروست دەبێتو ،

دەبێتە پاڵ پشت بۆ بزووتنەوەیەکی جیهانی ، کە بەردەوام لە دێر زەمانەوە بانگەوازی هەقو ڕاستەقینە دەکات لە سەر ئەم زەوی‌یە ، وە بە پشتیوانی خواش ئەم بانگەوازی‌یە هەتا هەتایە بەردەوام دەبێت •

دوا داواشمان سوپاس‌و ستایشێکی فراوانە بۆ پەروەرد گـــاری جیهـــان •

وسلام علی المرسلین والحمد لله رب العالمین •

ڕانیە مزگەوتی نورسی

١٥-٤-١٩٨٦



# پێڕست




رقم الاجازة ٧٧ في ٢٩-٤-١٩٨٦

رقم الايداع في المكتبة الوطنية بغداد ١٩٢ لسنة ١٩٨٧

## ئەم پەڕتووکە

- دەری دەخات کە عیزەت‌و شەرەف مەندی کۆمەڵی ئادەمیزاد بەستراوەتەوە بە چەندیەتی پا بەند بوونی ئەم کۆمەڵە بە ئاکارو ڕەوشتی بەرزو جوان ، ئاکارو ڕەوشتی بەرزو جوانیش بەرهەمی ئاشنایەتی‌و ژیانە لەگەڵ گیانی قورئاندا .
- ڕوونی دەکاتەوە کە یاسای ڕامیاری لە ئیسلامدا چ دەورێکی کاریگەرانەی هەیە بۆ تەنها ناسینی خوای پەروەردگار لە بواری بەندایەتی‌و ، مڵکەچی‌و داد پرسی‌و ، فەرمان کردن بە چاکەو ، قەدەغە کردن لە خراپەدا .
- دەری دەخات کە سەرتاپای بەرەی ئادەمیزاد لە ترازووی خوایدا لە یەك ئاستو پلە دان لە ڕوانگەی ئەوەوە کە هەموویان ئادەمیزادن با لە زمان‌و ، ڕەنگ‌و ڕوخسارو ، ڕەچەڵەکیشدا لیك جیاواز بن .
- ڕوونی دەکاتەوە کە یاسای ئابووری لە ئیسلامدا تا چ ڕادەیەك جیاوازە لەگەڵ یاساکانی ئیشتراکی‌و سەرمایەداریدا ، وە دەری دەخات کە تاکە یاسایەکی مام ناوەندی‌یەو هەڵقوڵاوی قورئانی پیرۆزە .
- ڕێمان دەگرێت‌و ڕێنومایمان دەکات کە چۆن پەیوەندی لە نێوان خۆمان‌و پەروەردگاردا ببەستین .

نرخی ( ٧٥٠ ) فلسە

مطبعة الحوادث هاتف ٤١٥٢٦٨٥